ناوی کتێب : حیجـاب ناسنامەی ئافرەتی ئیمانداره

نـوسـینـی : مەلا طاهر حسن حاجی نادر کەلەباشی

ژمارەی سپاردن : ( ١٢٤٢ ) ی ساڵی ( ٢٠١٣ )

ژمارەی چاپ : یـەکـەم

چاپخانە :سیما

نەخشەسازی بەرگ : مەریوان فتاح

تـایپ : هاوڕێز علی، محمد صابر، هاوکار ئاوات

ئەرکی لەچاپدانی: بەشی کۆمەڵایەتی خێرخوازی لقی پیرمەگرونی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان

پێشکەشە......................

پێشەکی......................

**بەشی یەکەم**

لقی یەکەم : پێناسەی پۆشاکی شەرعی .

لقی دووەم : بەڵگەکانی واجب بوونی پۆشاکی شەرعی ( الحجاب الشرعي )

یەکەم : بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆزدا.

دووەم : بەڵگەکان لە سونەتی پێغەمبەردا ( صلى الله عليه وسلم ).

سێ یەم : هەڵوێستی صەحابەکان لەم بارەیەوە .

لقی سێ یەم : ناوەکانی پۆشاکی شەرعی لە قورئانی پیرۆزدا .

یەکەم : لیباس

دووەم : خیمار

سێ یەم : جلباب

چوارەم : ثیاب

**بەشی دووەم :**

یەکەم : مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی

دووەم : بەڵگەکانی دەرخستنی دەم و چاو .

**بەشی سێ یەم ..**

لقی یەکەم : خۆجوانکردن و خۆ ڕازاندنەوە ( التبرج ) .

أ : لە ڕووی شەرعی یەوە :

یەکەم : جل و بەرگ و پۆشاك .

دووەم : ماددەکانی خۆجوانکردنی لەش وکو ( خشڵ و خڕخاڵ ).

سێ یەم : ماددەکانی خۆجوان کردن وەکو ئارایشت و سوراو سپیاو .

چوارەم : ماددەکانی خۆجوانکردن وەکو ( برۆ باریك کردن و گۆڕینی برۆو برژۆلەکان و نینۆکەکان ) .

پێنجەم : حەرامە ئافرەتی موسڵمان .....

شەشەم : یەکێ لەو شتانەی کە ئەمڕۆ بۆتە عادەت و زۆربەی ئافرەتی موسڵمان دەیکات ئەوەیە کە ئافرەت دەست و پەنجەو کوڵم و چاوو لێوەکانی بۆیە دەکات .

ب : لە ڕووی تەندروستی یەوە

ج : لە ڕووی ئـابوری یـەوە

## بەشی چوارەم :

یەکەم : بۆن خۆشی ئافرەتان ( الطیب والنساء ).

دووەم : هۆکارەکانی ڕووت و قوتی ( سفوری ) .

1- چاولێکەری
2- دەزگاکانی ڕاگەیاندن
3- ترسان لە لۆمەی خەڵکی .
4- هەندێک ئافرەت ئەڵێن باڵا پۆشیم لێ نایەت .
5- هەندێک ئەڵێن باڵا پۆشی نیشانەی دواکەوتنە
6- هەندێک دەڵێن باڵا پۆشی جل و بەرگێکی عەرەبی یە .
7- هەندێک ئافرەت ئەڵێن باڵا پۆش بیت کەس سەیرت ناکات .
8- حجاب نیشانەی پیری نیە .

## بەشی پێنجەم :

خوێندن و باڵا پۆشی .

## بەشی شەشەم :

ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی زیناو داوێن پیسی یەوە تووشی مرۆڤ دەبن .

یەکەم : نەخۆشی زوهری ( السفلس ).

دووەم : نەخۆشی سەیلان ( السیلان ) .

سێ یەم : نەخۆشی هاربز ( هربز جینتالس ) یان ( هربس الجنسی ) .

## بەشی حەوتەم :

جنـــس :

یەکەم : جنس لە ڕوانگەی علمانیەتەوە .

دووەم : جنس لە ڕوانگەی ئیســـــلامەوە .

# پێشکەشە

* بە دایك و باوكی بەڕێزم .

* بە هاوسەری دڵسۆز و خۆشەویستم، بەهەر پێنج جگەر گۆشەو نوری چاوانم (هیوا و سایە و سارا و سیوە و محمد ) .

* بە براو خوشكەكانم .

* بە هەموو ئەو دایك و باوكە بەڕێزانەی كەدڵسۆزانە دەیانەوێ منداڵەكانیان لەسەر بەرنامەو ڕێبازی پیرۆزی ئیسلام پەروەردەكەن و كچەكانیان فێری باڵا پۆشی و جل و بەرگی شەرعی دەكەن .

* بە هەموو ئەو خوشكە بەڕێزانەی كە دەیانەوێ خۆیان بپارێزن لەو شاڵاوی ڕووتی و قوتییەی كەئەورووپاو خۆرئاوا دەیانەوێ بەناوی پێشكەوتن و ناوی جۆراو جۆرەوە فێری ئافرەتی مسوڵمانی بكەن!؟.

* بە هەموو دڵسۆزانی ئیسلام كەدەیانەوێت ئافرەتی ئیماندار دەست بە ڕێبازی ئیسلامەوە بگرێ و دوربن لەڕووتیو قوتیو هەڵپەی ناحەزان و خوانەناسان.

# پێشـــەکی

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار لەسەر هەموو خەڵات و بەخششەکانی کە بە ئێمەی ئومەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەخشیوە، بەتایبەت خەڵاتی ئیمان کە ئیمانمان هەیە بە خواو بەڕۆژی دوای و گومڕاو سەرگەردانی نەکردوین، چونکە هەرکەسێ بەموسڵمانی بژی و خوای گەورە ئەو لوتفەی لە گەڵدا بکات بە ئیمانداری بچێتەوە لقای خوا بەڕاستی سەربەرزە و گەرەوی ژیانی دونیاو قیامەتی بردۆتەوە، ڕەحمەت و میهرەبانی خواش لە ئێمە و سەرجەم ئیماندارانی ئەهلی قیبلە بێت . حەمد و سەنای پێشکەش بەخوشك و برایانی بەڕێزم بکەم لەکوردستانی خۆشەویست بەتایبەت خوشکان بەئومێدی هۆشیارکردنەوەیان لەو شاڵاوی بێ دینی و فەسادیەی کەئەمڕۆ ئەمریکاو ئەوروپا لەڕێگای ئەڵقە لەگوێ کانیانەوە بەناوی پێشکەوتن و ئازادی یەوە دەیکەنە سەر جیهانی ئیسلامی لە ڕێگای سەدان ڕێکخراو سەنتەرەوە خۆیان کردووە بە پارێزەری مافی ئافرەت و فرمێسك تیمساحی بۆ دەرێژن، جا لەم ساتە وەختە مێژوویەدا بەواجبی شەرعی سەرشانی خۆمی دەزانم باسی پۆشاکی شەرعی ئافرەت بکەم و وەڵامی هەموو ئەو بیروباوەڕو بۆچونە نازانستی یانەش بدەمەوە کەڕەخنە لەئاینی پیرۆزی ئیسلام دەگرن و حیجابیان بەمایەی دواکەوتوی کۆمەڵگا ناوبردووە، چونکە گەورەترین کێشە لە ڕابردوو و داهاتوودا ئافرەت بووەو ئافرەت دەبێ، بۆیە دەبینیی زۆربەی کۆمەڵناس و فەیلەسوف و یاساناس و سیاسە تمەدارەکانیش خۆیان بە ئافرەتەوە سەرقاڵ کردووە و لەڕێگە ڕاستەکەی خۆیان لایان داوە کە خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆیان دیاری کردووە. جا ئومێدەوارم خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات بیکاتە خزمەتێکی بچکۆلانەش بەئاینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمانان، دەستی نزاو پاڕانەوەش لە خوای پەروەردگار بەرزدەکەمەوە کە میللەتەکەمان بگەڕێنێتەوە سەر بەهـا بەرزو بنەما ڕەوشتی یە بەرزەکانی ئیسلام و ڕێبازە ڕاستەکەی حەزرەتی محمد (صلى الله عليه وسلم).

مەلا طاهر حسن حاجی نادر کەلەباشی

**پێم خۆشە لە سەرەتای باسەکەوە پێناسەیەکی جلوبەرگ بکەین لەرووی زمانەوانی یەوە:**

لەزمانی کوردی دا ووشەی (( جلوبەرگ)) یان (پۆشاك) بەکاردەهێنین، ووشەی (جل) تایبەتە بەو بەرگەی کە بۆ هەندێ ئاژەڵ بەکار دە هێنرێت بەڵام بەشەکەی تری ئەم ووشە لێك دراوە کە (بەرگ) ە لەبنەرەت دا ووشەیەکی فارسی یەو بەواتای (گەڵا) دێت مەبەست لەو گەڵایانەیە کە درەختەکە دادەپۆشێت ،بەڵام ووشەی (پۆشاك) زاراوەیەکی هاوبەشە لە نێوان زمانی کوردی و فارسی دا واتە لەبەرکردن و داپۆشین . لەزمانی عەرەبیشدا زیاتر ووشەی (لباس) (حیجاب) بەکار دەهێنرێت لە زمانی ئینگلیزیش دا زاراوەی ( clothes ) و ( Dress ) بەکاردەهێنرێت.

**بێ گومان مرۆڤ بۆ سێ مەبەستی سەرەکی جلوبەرگ لەبەردەکات:**

**یەکەم:** جل و بەرگ بۆ ئەوەیە مرۆڤ لەسەرماو گەرما بپارێزێت.

**دووەم:** جل و بەرگ بۆئەوەیە داوێنی مرۆڤ بپارێزێت.

**سێ یەم:** جل و بەرگ دەبێتە هۆی جوانی مرۆڤ بۆیە زانایانی دەرون ناسی ئەڵێن جوانی مرۆڤ بکەیت بە دە بەشەوە نۆ بەشی لە جل و بەرگەکەیایەتی. لەسەرەتای دروست بوونی ژیان دا مرۆڤ بۆ ئەوەی خۆی لەگەرماو سەرما و گیان لەبەر و دڕندەکان بپارێزێت خانووی دروست کرد چونکە خانوو مایەی ئارامی و

وئاسودەی یە بۆی کەواتە دەتوانین بڵێین خانووی یەکەمی مرۆڤ جـل و بەرگەکەیـەتی و هـەموو کەسـێ سـەرەتاله لـە جـل و بەرگەکەی دا ئارام ئەگرێ و دواتر لەخانووەکەی دا نیشتە جێ ئەبێت.

# بەشی یەکەم

## لقی یەکەم: پێناسەی پۆشاکی شەرعی:

پۆشاکی شەرعی (الحجاب) بریتییە لەو پۆشاکەی ئافرەت لەشی خۆی پێدا دەپۆشێت لەبەرچاوی ئەو پیاوانەی کەمەحرەمی خۆی نین، بەواتایەکی تر پۆشاکی شەرعی ئەو پۆشاکەیە کە عەورەتی ئافرەت دادەپۆشێت لەبەرچاوی ئەو پیاوانەی کە مەحرەمی نین. هەروەها (حیجاب)بەواتای هەرشتێك ببێتە پەردەو بەربەست لەنێوان دوشت دا، زۆرکەسەس وای تێگەیشتووە کەحیجاب تەنها سەرپۆشێکە یان لەچکێکی سادەو ساکارە کەئافرەتان لەملی ئەکەن یاخود لایەکی سەری یان شێوەی قژی دادە پۆشێت نەخێر بالاّ پۆشی تەواو بریتیە لەو جلە ئاودامانەی کەهەموو لەشی ئافرەت دادە پۆشیٚو بەعەرەبی پێی دەوترێت (الحیجاب) پۆشاکی شەرعی حیجاب ئەو پۆشاکە شەرعیەیە کەهەموو لەشی ئافرەت دائەپۆشێتو ئەبێتە قەلاّو شوورەیەکی پتەو، کەخوای بالاّ دەستو کاربەجیٚ بۆ پاراستنی شەرەفو کەرامەتی ئافرەتی ئیمانداری داناوە بەشێوەیەکی پۆلاّینو بە هێز بۆ پاراستنو ڕاگرتنی کۆمەڵگا لەهەموو خراپەو داوێنٚ پیسی یەك، وە چوارچێوەیەکی دامەزراو بەهێزیشە کەئافرەت لەمیانەیدا ئەتوانیٚ کاری پەروەردەی بەرەکانی

دوواڕۆژو جگەرگۆشەکانی تێدا جۆش بداتو پەیکەری تەلاری دواڕۆژی گەل و نیشتمانێکی پاکو بێگەردی پێدابمەزرێنێت.

پۆشاکی ئیسلامی ئەو خانووەیە کە حورمەتو ناوەرۆکی ئەو ماڵە دەپارێزێت لەچاوی چاو چنۆکان لەزیانی دزو جەردەو پیاو خراپو گیانداره دڕندکان کەبەچواردەوری ئەو خانووەوەن. هەروەها پۆشاکی شەرعی ئەو بەرگە جوانە خوایی یەیە کە خوای گەورەو باڵا دەست کردوویەتی بە بەری میووەی پرتەقاڵو هەنارو لیمۆو نارنجدا، بۆ پاك ڕاگرتنیو پاراستنی ئەو میوەیەو خۆراکە لەهەموو میکرۆبو نەخۆشییەك، ئەو بەرگە ڕەق و پتەوەیە کەخوای کردوویەتی بە پارێزەری گوێزوو چوالەو بەپوختیو خاوێنی کاکڵەکەی دەپارێزێتو وەكو دایکێکی بەسۆز جگەر گۆشەکەی لەباوەش گرتووە، پۆشاکی ئیسلامی ئافرەتی ئیماندار وەك ئەو بەرگەوایە کە خوای گەورە بۆ ئەم بوونەوەرەی درووست کردووە داروو درەخت بەرگی هەیە ئەگەر توێکڵەکەی لێبکەیتەوە لەگەشەکردنو شکۆفە ئەوەستێ وەكو ئەو دەنکە گەنمو جۆیە وایە کەخوای گەورەو کاربەجێ بۆی دروست کردووە، لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا زاناکان چەند دەنکە گەنمێکییان لە ئەهرامەکانی میصردا دۆزییەوە مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ شەش هەزار ساڵ لەمەو بەر وەکو ئەو دەنکە گەنمەش وایە کە ئێستا ئێمە لەئاشی دەکەینو دەی خۆینو لەزەویە کشتوکاڵییەکان زەرعی ئەکەین

زاناکـان ئـەڵێن هـۆی مانـەوەی ئـەو دەنکە گەنمانـە بـەهۆی ئـەو بـەرگ‌و توێکڵەوەیـە کـەخوا بـۆی درووسـت کـردووە، لـەزنجیرە فلیمی حەزرەتی یوسف سەلامی خوای لەسەربێت کە لەکەناڵی ئاسمانی سەحەرەوە پێشکەش ئەکرا بەهۆی ئەو قاتی‌و قڕی‌و وشکە ساڵی یەی بەسەر وولاتی میصردا هـات کاهینـەکان ئەو گەنمەی هەڵیان گرت بوو بەرگەکەیان لێکردبوۆوە تـا سـەرەنجام خـراپ بـوو بـەلام ئـەو گەنمـەی کـە حـەزرەتی یوسـف (سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) هـەڵیان گرتبـوو بـە بەرگەکەیـەوە بـوو بۆیـە چـەند سـاڵ خـۆی گـرت‌و سـەرەنجام هـەموو ولاتـی میـصر لەو قـات‌و قـڕی و وشـکە سـاڵی ڕزگـارکرد. جـل‌و بـەرگی شـەرعی ئافرەتی ئیمـان داریـش وەك ئـەو بەرگەوایە کـە خـوای گـەورە بۆ ئەم زەوییەی درووست کردووە پێی دەڵێن (بەرگە هـەوا) ئـەوەتا خوای گەورە لە سورەتی ئەنبیائدا ئایـەتی( ٣٢)دائاماژە بۆ ئەم ڕاستیە گەورەیـە ئـەکات‌و ئەفـەرمووێت (وجعلنـا السَّماءَ سقفاً محفوضـاً). واتــە ئێمــە ئــەم زەوییــەمان بــە هــۆی بەرگێکــەوە پاراستووە، ئەگـەر ئـەو بەرگـەمان بـۆ درووسـت نەکردایـە نـەمان ئـەتوانی لەسـەری بـژین، بۆنموونـە لـە سـاڵی ١٩٠٨ بـەردێکی زۆرگــەورە لــەولاتی ســیبریا لەیــەکێتی ســۆڤیەتی جــاران لەئاسمانــەوە کەوتــە خــوارەوە (٣٠٠) مــەتر ئــەبوو، کێـشی تەقینەوەکەی سەد میگا تەن بوو، حەو سەد میل ئەرزی تەخت‌و خاپوور کرد‌و حەفتا هەزار مەتر زەوی لەناوبرد، لەدوری حافتا

میلەوە جلی بەبەری کەسەوە نەهێشت، زۆر وڵاتی ئەوروپای ڕووناك کردەوە، زانایان ئەڵێن ڕۆژانە هەزاران بەردی گەورەو نەیزەك لەئاسمانەوە ئەکەوێتە خوارەوە بەڵام بەهۆی ئەو بەرگە هەوایەوە کە خوا بۆ زەوی دروست کردووە ئەیپارێزێت، ئە گینا بە یەك بەردی گەورە ژیان لەناو ئەچوو.

پۆشاکی شەرعی ئەو پەرژینەیە کە بەچواردەوری باخچەی گوڵو خونچە و میوەی هەنارو سێوو هەرمێ دا دروست کراوە بۆ پاراستنی بەروو بوومە تازە پێ گەشیتووەکەی ئەو باخ و گوڵستانەی لەدەستی ناپاکانو چاوی چاو پیسو ورگ زلەکان.

پۆشاکی شەرعی وەكو ئەو پەرژینە ئابروو شۆخ و شەنگیو جوانیو ناسکی ئافرەتی ئیماندار. ئەشارێتەوە لە چاوی ناحەزانو دڵ نەخۆشەکان کەواتە چۆن پەرژینی گوڵ و باخ و گوڵستانەکان پێویستە جلوبەرگی ئافرەتی ئیمانداریش ئاوا پێویستیەکی کۆمەڵایەتیو بەڵگە نەویستە بۆ پاراستنو تێك نەچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگا. بۆیە خوای گەورە بە باڵای ئافرەتی ڕەوابینیوە و بە بنەمایەکی پتەوی کۆمەڵگای داناوە لە سەر ڕووی زەوی هەروەك لە سورەتی الاحزاب ئایەتی (٥٩) دا دە فەرموویەت ((يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً )).

ئەفەرمویٚ ئەی خۆشەویستی خوا بڵێ: پێغەمبەر لەحەزرەتی جبریلی پرسی و فەرمووی چی بڵێم و بەکێ بڵێم، خوا بەحەزرەتی جبریلدا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە و فەرموی: بەهەموو خێزانە بەڕێزەکانت و کچەکانت وەك حەزرەتی فاتمەو زەینب و روقیەو ئم کلسوم هەموویان کۆ بکەرەوە ئەم پەیامەی خوایان پێبڵێ کەخۆیان سەرتاپا داپۆشن و جوانی و ڕازاوەیی خۆیان دەرنەخەن چونکە لە چەندان ڕیوایەتدا هاتووە کەئافرەتان بە(ئازاد و کۆیلەکانەوە)و(کەنیزەکان) ەوە شەوانە بەیەکەوە ئەچوونە دەرەوە بۆ کاروو باری پێویستی خۆیان بۆ ناو دار خورورما و قامیش و بێشەلآنەکان پیاوان و گەنجانی فاسق و خراپەکارانیش ڕێگەیان پێ ئەگرتن تەشقەلەیان پێ ئەکردن خوای گەورە لەم ئایەتە قورئانیەدا ئەفەرموێت ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەم بانگەوازو پەیامە تەنیا بۆ خێزان و کچە بەڕێزەکانت نیە بەڵکو بۆ هەموو ئافرەتانی ئیمانداره تاڕۆژی دوایی، لە سەرەتای ئایەتەکەشەوە خوا ئەمر بەپێغەمبەر ئەکات کە لە پێشدا لەخێزان و کچە بەڕێزەکانیەوە دەست پێ بکات ئینجا پەیامەکە بە ئافرەتانی ئیماندار بگەیەنە، واتە هەر شتێك لەم دینە پیرۆزەدا هاتبێتە خوارەوە لەپێش هەموو کەسێکەوە دەبێت پێغەمبەرەکەی خۆی ماڵ و منداڵەکەی جێبەجێی بکات ئینجا ئەمر بە ئومەتەکەشی بکات جێ بە جێی بکەن، بەڕاستی لەکەیەکی گەورەیە بەسەر ئەم دینەوە کە زۆرجار کچەمەلاو کچە

شێخو حاجیو موسوڵمانی باش قاچی ڕووتەو خەڵك ئەڵێت ئەمە كچە مەلاكەیە وایە قوڕبەسەر سەری ئەو خەڵكە عەوامو نەزانە هەروەها خوای باڵا دەست وكاربەجێ بەئەمر ئەفەرمووێ ئەی محەمەد ئەم پەیام و ڕیسالەیە تەنها بۆ خێزانو كچەكانت نیـە (( نساء المؤمنین)) بۆ هەموو ئافرەتانی ئیماندارە، ئەم ئەمرەش لەزمانی عەرەبیدا بۆ واجبە واتە: باڵا پۆشی واجبە وەكو نوێژو ڕۆژو زەكات ..... هتد. بۆ یە هەر ئافرەتێ خۆی بە ئیماندارو باوەڕدار ئەزانێت خوای گەورە بانگی ئەكات بۆ جێبە جێكردنی ئەم فەریزە خواییە كەمایەی ڕەزامەندی خواو بەدەست هێنانی بەهەشتی پانو بەرینە.هەروەها ئەفەرمویێ ((یۆ تین علیهن مِن جلا بیبهینّ)) بەبەرگێكی سەرتاپا ئاودامان خۆتان دا بپۆشن ((ذلك أدنى أن يُعْرَفنَ)) ئەو خۆداپۆشینە نازنامە ئافرەتی باوەڕدارەو پێی ئەناسرێتەوە وە زۆر ڕاستە جاری واهەیە ئەچیتە دائیرەیەكەوە یان ئەچیتە سەیارەیەكەوە یان ناو بازاڕێكەوە ئافرەتێكی داپۆشراو ئەبینی یەكسەر ئەزانی كە ئەو ئافرەتە ئیماندارەو بەگەورەو سەربەرزی ئەزانی ((فلایۆذین )) خەڵكی نالە باروو چاو پیسو دڵ خراپیش ناتوانی بە چاوی خراپەوە سەیری بكات. كەواتە پۆشاكی ئسلامی چەقڵی چاوی ناحەزانو ئەو كەسانەیە كەحەزیان لە داوێن پیسو بەرەڵایو تێكچوونی شیرازەی خێزانو داوێن پیسیە هەروەها هۆكارێكیشە بۆ بەرز ڕاگرتنی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی

سەبارەت بە وشەی(جلابیب) کە لەکۆتای ئایەتەکەوە هاتووە کۆی ووشەی (جلباب)ە ئەو پۆشاکەیە کەئافرەت دادەپۆشێت هەر لەسەرەوە تاخوارەوەی لەش هەروەكو إبن عباس فەرموویەتی:

- جلباب: بریتیە لەو پۆشاکەی کەئافرەت خۆی پێ دادەپۆشێت.
- جلباب: بریتیە لەپۆشاکێکی فراوان کەئافرەت خۆی پێدادە پۆشێت .
- جلباب: بریتیە لەکراس.
- جلباب: بریتیە لەگشت بەرگو پۆشاکێك لەسەر جلەکانیەوە لەبەری دەکا واتە:عەبا.
- جلباب: ئەو عەبایەیە کەلەسەر کراسەوەو بەسەر سەرو پۆشاکەکەیدا لەبەریدەکات بەخۆیدا شۆڕیدەکاتەوە دێتە خوارەوە پێیەکانیشی دادەپۆشێت.

أبن عەرەبی لەلێکدانەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە دەفەرمووێ ((یدُنِینَ علیهنَّ مِن جلا بیبهنِ)) دا دەفەرمووێ لەشیکردنەوەی زاراوەی (جلباب) دا، زانایان جیاوازیان هەیە هۆکەشی بۆ لێك نزیکبوونی واتاکان دەگەڕێتەوە ئەوەش کەواتای ڕاستو درووست دەدا بەدەستەوە ئەوەیە کەجلباب بریتیە لەو پۆشاکەی کەلەشی ئافرەت دادەپۆشێت بەواتایەکی تر بریتیە لەپۆشاکێکی فراوانو ئەستوور کەلەسەر جلو بەرگەکانی تری ئافرەتەوە لەبەردەکرێت گشت لەش هەر لەسەریەوە تادەگاتە پێیەکانی دادەپۆشێت بۆیەو دەتوانین بلێت

جلباب بریتیە: لەو عەبایەی کە ئافرەت لەسەر جلەکانیەوە دەیپۆشێت کە لەسەریەوە تاپێیە کانی دادە پۆشێت بۆ یە پێویستە لەسەر ئافرەتانی موسڵمان کە ئەم ئایەتە پیرۆزە لەسەر خۆی جێبەجێبکاتو ملکە چی فەرمانەکانی خوابێت.

## لقی دووەم: بەڵگەکانی واجب بوونی پۆشاکی شەرعی(الحیجاب الشرعی).

بەڵگە کانی واجیب بوونی پۆشاکی شەرعی لەقوورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەردا.

**یەکەم: بەڵگەکان لەقورئانی پیرۆزدا:**

پۆشاکی شەرعی فەرزێکە وەك و نوێژکردنو ڕۆژوو گرتن، لەقورئاندا پۆشاکی شەرعی فەرزێکە وەك و نوێژکردنو ڕۆژوو گرتنو حەجو زەکات نابێت پشتگوێ بخرێ، هەر ئافرەتێك باوەڕی بە واجب بوونی نەبێتو بەو نیازە وازی لێبینێت پێی کافر ئەبێت، بەڵام ئەگەر بەهۆی نەریتی خراپی کۆمە ڵگاوە وازی لێبێنێ بەڵام بڕوای تەواوی بەفەرزیەت بوونی هەبێت ئەوە سەرپێچی لەفەرمانەکانی خوا پێغەمبەری خوا کردوەو گوناهبارە .

●خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی الاحزاب ئایەتی (٥٩) ئە فەرموویێت ((يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رحِيماً ))واتە ئەی خۆشەویستی خوا بەخێزانو

کچە بەرێزەکانت و هەموو ئافرەتانی ئیمانداربلێ کە خۆیان داپۆشن ( إبن کثیر) لە تەفسیر ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەڵێت: خوای باڵا دەست و کاربەجێ فەرمانی بەپێغەمبەرەکەی کردووە کە فەرمان بە هەموو ئافرەتانی بڕوادار بکات سەرەتاش بەخێزان و کچە بەرێزەکانی خۆی کەعەباکانیان بەسەر خۆیاندا بدەن و لە تەوقی سەریانەوە تا بنی پێیەکانیان شۆڕی بکەنەوە بەشێوەیەکی وا هەموو لەشیان دا پۆشێت، بۆ ئەوەی لەئافرەتانی زەمانی نەفامی جیابکرێنەوە دیارە ئەم فەرمان کردنە خوای گەورە بەپێغەومبەرکەی بە صیغەی ئەمرەو ئەمریش لێردا بۆ واجب بوونە کە بەواتای فەرز دێت. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمر بەئافرەتانی موسڵمان بکە کەپۆشاکی شەرعی بپۆشن و عەباکانیان بەخۆیانا بدەن (( ذلك أدنى أن يُعْرَفنَ )) ئەو خۆ داپۆشینەش باشترین ناسنامەی ئافرەتی ئیماندارەو پێی ئەناسرێتەوە. ولاهی کەئەچیتە شوێنێك و ئافرەتێکی داپۆشراو ئەبینی یەکسەر ئەزانی ئەو ئافرەتە ئیماندارەو بەگەورە و ئەمینی ئەزانی لێرەدا بە پێویستی ئەزانم بە سەر هاتی یەکێك لەنوسەرە ئیسلامییەکان کە خۆی بەچاوی خۆی بینیویەتی (مامۆستا علی باپیر لەکتێبی ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەت دا لاپەرە ( ٢٥٢) گێراویەتەوە). حەز ئەکەم منیش بیخەمە بەرچاوی خوێنەرانی بەرێز، ئەو نوسەرە بەرێزەش کەخۆی ئەی گێرێتەوەو ئەڵێت چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێکیان کچێك هاتە

نوســینگەکەمەوە لــەکۆلێجی شــەریعە هــەرزوو هەســتم کــرد لەچکێکی ســاختەی کــردووە نیــوەی قــژی بەدیارەوەیــە دووای وەرگرتنــی مۆڵــەت زۆر بەناســۆرەوە بەســەرهاتی تــاڵی خــۆی بــۆ گێرامەوە بەهیوای ئەوەی یارمەتی بدەم و لەو گرفتە گەورەی کە بــە ســەری هــاتووە ڕزگــاری بێت،بــە کــوردی و کرمــانجی بــە سەرهاتەکەی ئەوە بوو کە ئەو کچە لەماڵێك دا گەورە بوو کەهیچ پاپەنــدێکی ئاینیــان نــەبووە، ئــەم کــچەش ســەرەتا لەقوتابخانــەو پاشــان لــەزانکۆ خوێندوویــەتی و هــیچ چــاو دێرێکــی خێزانــی و ئاینیشی نەبووەو لەو کاتــەی کــە قوتــابی ئامــادەیی بــووە کــوڕان دەوریــان داوەو زۆر پێــی (معجیــب) بــوون و بــەردەوام هانیانــداوە کــەزیاتر خــۆی ڕووت بکاتــەوەو جــل و بــەرگی تەســك و ســەرنج ڕاکێش لەبەرکات، ئــەڵێت منــیش داواکــەیانم پێخــۆش بــوو زیــاتر تەسلیمی قسەکەیان ئەبووم، بەجۆرێك لە قۆناغی زانکــۆدا زیــاتر لەمەسەلەی خۆڕازاندنــەوەو خــۆ ڕووت کردنــەوەدا ڕۆدەچــووم تــا گەنجێك بەتەواوی دڵی داگیرکردمو ئەویش وای پیشان ئەدا کــە لــە قــوڵای دڵ و دەروون و ناخیــەوە منــی خــۆش وئــەوێت، دووای بــیرو ڕاگــۆڕینــەوە داوام لێکــرد کــە بەڕاســتی ئــەو منــی خــۆش ئەوێــت بێتــە داخــوازیم، ئــەویش وتــی بێخــەم بــە بــەم زوانــە دێمــە داوات و دەبینەهاوســەری ژینــی یــەکتری، ئەمــەش بووبــە هــۆی ئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پــە یوەنــدی خۆشەویستیمان بــە هێزتــر ئەبوو، سەرئەنجام لە یەکێك لە دیدارەکانمان کچێتی نەهێشتم و تــادوای چــەند ڕۆژێك داوام لێکــرد کــە کــار لــەکار تــرازاوەو بێتــە

داوام، ئەویش زۆر بەسوکیەوە وتی هێشتا بڕیاری ژن هێنانم نەداوە، هەر وەختێکیش بڕیاری ژن هێنانم دا کچێکی شەریف و بە حەیا دێنم کە خۆی نەکردبێتە بەردەستی کەس. ئە لێت لەو کاتەوە کە ئەو قسەیەم بیست موچورکەیەك لەبنی پێمەوە دەستی پێکردوو لەتەوقی سەرمەوە دەرچووە! ئەنجا هەستم کرد کەهەڵخەڵەتێنراوم و گاڵتەم پێکراوە هەر چەند خێزانەکەم ملتەزیمی دین نەبوون بەڵام لەبەر عورف و نەریتی کۆمەڵگا نەموێرا مەسەلەکەم بۆ خێزانەکەم بگێڕمەوە چارەنوسی خۆم بەرەو نادیاری بەرم، بەدەم ئەو هاوارو ناڵیەوە وتی بەڕاستی ئەنجا بۆم دەرکەوتووە ئەگەر ئەمرەکانی خواو پێغەمبەری خوام جێبەجێ بکردایە بەم ڕۆژە ڕەشەی ئێستا نەدەگەیشتم و ناسنامەی پاکی و بیگەردی خۆم لە دەس نەئەدا، ئێستا هاتووم بۆلای تۆ وەك و برایەك چارە سەری ئەم کێشەیەم بکەی، ئەویش وتی خوشکی خۆم هەرشتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی فەرموویانە بۆ قازانجی ئینسان و کۆمەڵگایە ئافرەتەکەش وتی بەپشتیوانی خوای گەورە لەم ڕۆوە هەوڵ ئەدەم کەخۆم داپۆشم لە ئارەزووەکانی نەفس و هەواوم دورکەومەوە. ئەو پۆشاکەی کەفەرزی خوایە ناسنامەی ئافرەتی ئیماندارە بیکەمە بەرم. کەواتە حیکمەتی ئەو پۆشاکەی کە خوالەسەر ئافرەتانی ئیمانداری فەرز کردووە بۆ گەورەیی ڕێزو حورمەتی ئافرەتە.

**دووەم: بەڵگە لەبەڵگەو دەلیلەکانی قورئانی پیرۆز:**

ئایەتی سی ویەکی سورەتی نوورە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوْ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنْ الرِّجَالِ أَوْ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ).

واتە:ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بە ئیمانداران بڵێ: کەچاوی خۆیان دەرنەخەن وداوێنی خۆیان بپارێزن لەڕێگەی شەرعی یەوە نەبێت ئارەزووە سێکسیەکانی خۆیان جێبەجێ نەکەن باجوانی وزینەتی خۆیان دەرنەخەن‌و مەگەر ئەوە نەبێت کە بۆ زەروورەت دەردەکەوێت کە زانایان فەرموویانە دەم و چاو و هەردوو دەستیان نەبێت تا مەچەك، با لەچکەو پۆشاکەکانیشیان بەسەر سینگ وگەردنیانا بەردەنەوە بۆئەوەی جوانی ورازاوەیی خۆیان دەرنەخەن تەنیا بۆ مێردەکانیان نەبێت، یان باوکیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕەکانیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان براکانیان، یان کوڕی براکانیان، یان کوڕی خوشکەکانیان، یان ئافرتانی وەك خۆیان واتە ئافرەتانی

مسولْمان نەك ئافرەتانی نامسولْمان، كەلەوانەیە لای پیاوانی نامسولْمان باسیان بكەن وببێتە هۆی بڵاو بوونەوەی فیتنەو فەسادی، یان بۆ كەنیزەكەكانیان كەموڵكی خۆیانن یان بۆ ئەو پیاوانەی كەپێویستیان بەئافرەت نەماوەو مەترسی خیانەتیان نی یە وەكو پیاوە پیرە پەككەوتووەكانیان، یان ئەو پیاوە گێلانەی كە لەبارەی سێكسیەوە هیچ نازانن، یان ئەو منالْە ساوایانەی كەهێشتا تەمەنیان نەگەیشتۆتە بالْغ بوون. ئەبێ ئافرەتانی ئیماندار ئەو ڕاستییە بزانن كە حەزو ئارەزووی منالاْن پەیوەندی بە بالْغ بوونەوەیە، چونكە مندالْی وا هەیە پێش تەمەنی دەسالْی وپێش بالْغ بوونیان هەستی سێكسی و ئارەزووی ئافرەتان دەكات. واتە سەیركردنی (النظر)ی مندالْ بۆ ئافرەت پەیوەندی بەتەمەنی بالْغ بوونەوە نییە بۆیە دەبێت خوشكان لەهەر شوێنێك مندالْیان لەگەلاْبوو تێبینی ئەوە بكەن ئەگەر بەشەهوەت وئارەزووەوە سەیری ئافرەتیان ئەكرد ئەبێت خۆیان دابپۆشن و خۆیان لەلایان ڕووت نەكەنەوە. زانایان ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت دەفەرموون ئایەتی سی و یەك سوورەتی نوور كەخوای گەورە دەفەرموێت: ((أو الطفل اللذين لم يظهروا على عورات النساء )).

مەبەستی لەو منالْانەیە كە هیچ ئارەزوویەكی سێكسیان لەئافرەتان نی یە ئارەزوویان بۆ ناجولْێت بەلاْم هەندێ منالْ هەیە پێش بالْغ بوونیان حەزو ئارەزوویان بۆ ئافرەتان

ئـەجولێت، پڕبەچـاو پڕبـەدڵی ئـارەزووەوە سـەیریان دەکـەن. ئەبێـت ئافرەتـان خۆیـان لـەو جۆرە مندالأنـە بپـارێزنو خۆیـان لەبـەر چـاویان دەرنەخـەن، چـونکە لەوانەیـە منـداڵی وا هەیـە بەهۆی پـەروەردەی ماڵ و ژینگەکەیـەوە کە زۆر باسـی ئـافرەتی تیابکرێت زوو حەزوو ئارەزووی ئافرەتان لە ناخیا بڕسکێ، واتە ئـەو جـۆرە مندالأنـە زووتـر ئـارەزووی سێکـسیان ئـەجولێت و ئـەبێت ئافرەتـانی ئیمانـدار وریـای ئـەم ڕاسـتیانە بـن، هـەروەها لەکۆتای ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: (بأرجلهن ليعلم مايخفين من زينتهن) ئەی پێغەمبەری خوا پێیان بڵێ نابێت ئافرەتی ئیماندار قاچـی بەئەرزەکـەدا بکێـشێ بـۆ ئـەوەی بـەدەنگی خڕخـاڵو زێڕەکـەی سـەرەنجی پیـاوان بـۆ لای خـۆی ڕانـە کێـشێت، بـە عیبـارەتی ئـەم ئایەتـە نابێـت ئـافرەتی موسـڵمان پێلأوێك لـەپێ بکات کە بەڕێگادا ڕۆیشت تەقەی بێت یەکسەر پیاو ئاوڕبداتـەوە بۆی، ئە بێت، لە کۆتای ئایەتەکەشدا ئەفەرمووێت (وتوبوا إلى الله جميعـا أيهـا المؤمنـون) ئیمـان داران لـەکردەوە خراپـەکانتان پەشیمان ببنەوەو تۆبە بکەن بۆ ئەوەی خوای گەور سەربەرزوو سەرفرئزی دنیاو قیامەتان بکات.

**سێیەم بەڵگە لەبەڵگەو دەلیلەکانی قورئانی پیرۆز:**

ئایـەتی سـیو سـێی سـورەتی أحزابـە کـەخوای پـەروەردگار ئەفەرمووێت ((وقرنَ في بيوتكنَّ ولا تَبرّجْنَ تَبَرُّجَ الجاهيلهَ ولأولي

وَ اقِمْنَ الصَلوةَ و ءاتِينَ الزَكوةَ و اطعنَ الله ورسولَهُ إنما يُرِيدُ الله لِيُذهِبَ عنكُم الرِّجس أَهلَ البيت و يُطهيرَكُم تَطهيراً)) ئافرەتانی ئیماندار لەماڵەکانی خۆیان بمێنەوەو بۆ کارێکی زۆر پێویست نە بێت و کەسێکی مەحرەمیان لەگەڵدا نەبێت مەڕۆنە دەرەوە ئەگەر ڕۆیشتنە دەرەوەش جوانی و ڕازاوەی خۆیان وەك و ئافرەتانی جاهیلی دەرمەخەن چونکە ئافرەتان لە زەمانی جاهیلیەتدا لە ماڵەوە بۆنی چڵك و چەپەڵیان لێدەهات بەڵام کەدەچوونە دەرەوە جوانترین و تەنکترین جل و بەرگیان لەبەرئەکرد باشترین عەتریشیان لەخۆیان دەداو بەبێ ئیش وکار ئەچوونە بازاڕ، بە داخەوە ئافرەتانی ئێستا ڕەفتاری سەردەمی جاهیلیەتیان زیندوو کردۆتەوە لەماڵەوە بۆنی ناخۆشیان لێدێت و کەئەچنە دەرەوەش جوانترین جل و بەرگ و باشترین عەتر بەکار ئەهێنن، بەبێ ئیشێکی زەروری دووکان بەدووکانی ئەو بازاڕە ئەگەڕێ ئەمە چیە مەکسیەك یان شامپۆیەك ئە کڕێت، خوشکی بەڕێزم، خێر لەوەدایە هەموو ڕۆژوو سەعاتێك ڕانەکەی بۆ بازاڕ ئەگەر زەروور نەبووی مەچۆرە بازاڕ واتە بەپێی پێویستی بچۆرە بازاڕو کەچوویتە دەرەوەش با جل و بەرگێکی شەرعی و ئافرەتێك یان کە سێکی مەحرەمت لە گەڵدابێت خێرا ئیشەکەت بکەو بگەڕێوە، ئەگەر بەوردی سەرنجی ئایەتەکە بدەین ئە بینین خوای گەورە خۆ داپۆشینی پێش نوێژ و ڕۆژو زەکات دان خستووە واتە خۆداپۆشین وەك نوێژ و ڕۆژو زەکات و ئەرکەکانی تری ئیسلام فەرزە، مامۆستا میرزا ئەحمەدی میرزا

ڕۆستەمی لە کتێبە کەی خۆیدا بەناوی (پۆشاکی ئسلامی مایەی خۆش بە ختی تاك و کۆمەڵە)[1] دەڵێت: لە سالانی ڕابردوودا لەڕاپرسیەکی کەناڵی تەلەفیزیۆنیدا چاو پێکەوتنیان لەگەڵ خەڵکدا ئەکرد بەتایبەتی پیاوان سەبارەت بە دیاریدەی خۆ ڕازاندنەوەی ئافرەتان بۆ دەرەوەی ماڵی خۆی، پر سیاری لەپیاوێك کردوو وتی: ڕات چیە سەبارەت بەخۆجوانکردن و ڕازاندنەوەی ئافرەتان بۆ دەرەوە ووتی: وەڵاهی بە دیاریدەیەکی زۆر خراپی دەزانم وتیان: بۆ چی ووتی: من بەخێزانەکەی خۆما ئەزانم کە بەجوانترین جل و بەرگەوە ئەڕواتە دەرەوە هەر کەهاتەوە ماڵیشەوە جل و بەرگە جوانەکەی فڕێدەدا کام جل و بەرگ ناشرین و خراپە ئەوە لەبەر ئەکات تەنانەت جل و بەرگیش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر گەرم و گوڕی خۆشەویستی بەینی ژن و مێرد بەلام بە داخەوە ئافرەتان ئەوندەی گرنگی بەدەرەوە ئەدەن نیوەی ئەوەندە گرنگی بەماڵەوە نادەن و دڵی پیاوەکانیان ڕازی بکەن و چاویان تێربکەن، پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) دەفەرمووێت: هەر ئافرەتێك ئەو پێنج نوێژەی کەخوا فەرزی کردووە لەسەری بکا و مانگی ڕەمەزان بگرێت و دڵی مێردەکەی ڕازی بکات لەسەر دینی خوا ڕۆژی قیامەت لەهەر یەکێك لە هەشت دەرگاکەی بەهەشتەوە بیەوێ ئەچێتە ژورەوە.

---

[1] پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاك و کۆمەڵە، احمد میرزا ڕۆستەمی

**دووەم : بەڵگە کان لەسونەتی پێغەمبەردا :**

پۆشینی پۆشاکی شەرعی واجبە لەسەر ئافرەتی موسڵمان بەگوێرەی بەڵگەکانی قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەرو فەرموودەی ئەسحابەکانو فەرموودەی پێشەوایانی ئیسلام زانا بەرێزەکانی ئیسلام، هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کەپۆشینی پۆشاکی شەرعی واجبە لەسەر ئافرەتی موسڵمان کەهەموو گیانو لە شی خۆی دا بپۆشێ و نابێت خۆی بەدەر بخات لەبەر چاوی ئەو کەسانەی کە مەحرەمی نین، واتە پۆشاکی شەرعی لەسەر هەموو ئافرەتێکی باڵغی موسڵمان واجبەو فەرزە دە بێت بەتەواوی پابەندی بێت، بەدڵنیاییەوە هەر ئافرەتێك پۆشاکی شەرعی لەبەرنەکا بەپێی فەرموودەی قورئانو سوونەتی پێغەمبەر گوناهبارەو گوناهە کەشی لەتاوانە گەورەکانە، خوای گەورە ڕۆژی قیامەت بەتوندی لێی دە پێچێتەوەو سزای توندە ئەدا.

فەرموودەکانی پێغەمبەریش لەسەر واجیب بوونی پۆشاکی شەرعی ئافرەتی موسڵمان لە مانەی خوارەوە دەر ئەکەوێت.

**یەکەم:** پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ( صنفان من اهل النار لم ارهما بعد قوم معهم سیاط کأذناب البقر یضربوون بها الناس، و نیساءٌ کاسیاتٌ عاریاتٌ، مائلات ممیلات رؤسهُنَ کأسنمةِ البخت المائلةَ، لایدخلْنَ الجنة ولایجدنَ،

ريحها، وأن ريحها ليو جَدُ من مسيرة كذا و كذا)[٢] ئەفەرمویّ: دوو کۆمەڵ هەن لەناو ئومەتەکەما من نەم بینیوون و ئەهلی ئاگرن. کۆمەڵی یەکەمیان: ئەفەرمویّ ئەو جەلادانەن کە قامچی یان کێبلیان بەدەستەوەیە وەکو کلکی مانگاولیە واتە لەخوارەوە ریشاڵ ریشاڵە بۆ ئەوەی باش ئازاری خەڵکی پێ بدەن، ئەو جەلادانەی کە لەخەڵك ئەدەن ئەهلی ئاگرن. کۆمەڵەی دووەمیشیان فەرمووی: ئافرەتانێکن کە بەرواڵەت جل و بەرگیان لە بەردایە بەڵام رووتن واتە جلیان لە بەردایە بەڵام چەند شوێنێکی لە شی بەدەرەوەیە تەنورەی لە بەردایە بەڵام نیوەی قاچی رووتە کراسی لە بەردایە بەڵام نیوەی قۆڵی رووتە یان جلی لەبەردایە بەڵام تەسك و تەنکە کە ئەندامەکانی لەشی دەردەخات یان لاشەی دەر ئەپەڕن، کە بەرێگاشدا ئەڕوات بە لەنجەولارو عیشوەو نازەوە ئەڕۆن بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆیان راکێشن ، قژیشیان لەسەر تەوقی سەریان کۆئەکەنەوە ئەیکەن بەتۆپەڵ وەکو پشتی ووشتر، فەرمووی ئەم دوو کۆمەڵەیە ناچنە بەهەشتەوە نەك ناچنە بەهەشتەوە بەڵکو بۆنیشی ناکەن کە بۆنی بەهەشت ساڵەهای ساڵ رێ ئەڕوات. ئەم فەرموودە موبارەکە هەڕەشەیەکی روون و ئاشکرای تیایە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە پۆشاکی شەرعی لە بەرناکەن ،بە زاراوەی

---

[١] صحیح مسلم ژمارە - ٢١٢٨-

ئەمڕۆ سفورن،کەواتە خوشکانی بەڕێز وریاو هۆشیاربن جلو بەرگـە کانتـان لـەم جۆرەیـان نـە بێـت، هـەروەها پێغەمبـەری سـەروەرمان دە فـەرمووێت( مِـن اشـراط الـسّاعةِ ان تظهـر نـساء كاسياتٌ عارياتٌ ) یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت کە ئەم بوونەوەرە ئالٌو گۆڕی بە سەردا دێت و هاوسەنگی لە دەست ئەدات ئەوەیە کە ئافرەتانی موسلّمان جلو بەرگێك لە بەر ئەکات نیـوەی دا پۆشـراوە و نیـوەی ڕووتـە. بە ڕاسـتی مەبەسـتی ئـەم فەرموودە پیرۆزە هاتۆتە دی.

دووەم: پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکی تریا دە فەرموێ: ثلاثةٌ لاتسأل عـنهم – يعنى لأنهم من الهـالكين: رجلُ فارق الجماعة و عصى إمامه و مات عاصياَر وأَمة أو عبدأبق فمـات، و إمـرأة غـاب عنهـا زوجهـا، وقـد كفاهـا مؤونـة الـدنيا، فَتبرجـتْ بعـدهٌ فلاتـسأل عـنهم ))[٢] دە فـەرمووێت سـیٚ کـەس هـەن هـەرگیز دەربـارەی ئەوانـە پرسـیارم لێمەکـەن چـونکە ئـەوان مـالٌ وێران و تیاچوون.

١- پیاوێکـە کـە لـە کۆمـەڵی موسـڵمانان دوور ئەکەوێتـەوە بـە بێمەبەستێکی شەرعی سەر پێچی پێشەوای موسڵمانان ئەکات، ئەگەر لە سەر ئەم سەر پێچییەش بمرێت و تۆبەی لەسەر نەکاتو نەگەڕێتەوە ڕیزی موسڵمانان گوناهبارە.

---

[٢] رواه الحاكم وأحمد وصححه الالبانى في سلسلة الصحيحة:(٨١/٢) ژمارە ٥٤٢

٢-کۆیلەیەکە لەژێردەستی خاوەنەکەی ڕابکا بەو سەرپێچیەوەش بمرێت.

٣- ئافرەتێك مێردەکەی لەماڵ نەبێتو هەموو پێداویستیەکانی ژیانیشی بۆ دابین کردبێت سەرەڕای ئەوەش ناپاکی هاوسەرایەتی لەگەڵدا بکات و دەستی پیاوی نامەحرەم بگرێت و بیهێنێتەماڵەوە یان جوانیو ڕازاوەی خۆی بۆ خەڵك دەربخات.

سێیەم: عبدالله کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لەسەربێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت: پێغەمبە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (المرأة عورة)[٤]لەشی ئافرەت هەمووی عەورەتە لەبەر ئەوە واجبە هەموو لەشی داپۆشێ و دروست نیە خۆی لەبەرچاوی پیاوانی نامەحرەم دەرخات، بێجگە لەو شوێنانەی کە شەریعەتی ئیسلام ڕیگەی پێ داوە. وەكو دەمو چاوو لەپی دەست.

چوارەم: باوکی مالیکی کوڕی ڕەبیع ئەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەکاتیکا لەمزگەوت ئەچووە دەرەوە بینی ژنو پیاو بەتێکەڵی بەیەکەوە ئەڕۆن فەرمووی: (إستأخرنَ فليس لكن أن تحققن الطريق عليكنُ بحافات الطريق، فكانت المرأة تلصق بالجدار، حتى إن ثوبها ليتعلق بالجدار، من لصوقها به)[٥]فەرموی ڕاوەستن و لەسەرخۆبڕۆن نابێت ئاوا بەپانی ڕێگاکەیا بڕۆن فەرمووی قەراغەکەی بگرنو بەلاڕێیەکەدا بڕۆن. ئەفەرموێت هەرئەوەندە بەس بوو کەئافرەتان گوێیان لە پێغەمبەر

---

[٤] سلسلة الاحاديث الصحيحة ژمارە(٢٦٨٦)

[٥] صحيح سنن ابي داود ( ١٠٤٠ ) رواه البخاري .

( صلی الله علیە وسلم)بوو وای فەرموو: وەڵاهی ئافرەتان وایان لێهات ئەوەندە بەبن دیوارەکاندا دەڕۆیشتن و دیوارەکە هەموو جلە کەیانی بردبوو ئەوەندە خۆیان بەدیوارەکەوە نوساندبوو، فەرمووی با ئەو دەرگایە بەس ئافرەتی لێبێتە ژوورەوە، تا ئەم ڕۆش ئەو دەرگایە بەس ئافرەتی لێ ئەچێتە ژوورەوە، ئە گەر پیاوێکی نەشارەزا بچێتە ژوورەوە یەکسەر پۆلیس بانگی ئە کات چونکە لەو دەرگایەوە چوونە ژورەوە قە دەغەیە. ( أم سلمە)ی دایکی ئیمانداران ئە فەرمووێ کە نوێژی جومعە تەواو دەبوو، پێغەمبەروو صحابەکان ڕائەوەستان هەتا ئافرەتان ئە گەیشتنە ماڵەوە ئینجا پیاوان ئەهاتنە دەرەوە، ئێستە شوێنی ئافرەتان جیاوازە لە مزگەوتی پێغەمبەر لەشاری مەدینە پۆلیس لە بەردەگاکە وەستاوە هەرکاتێك پیاوێك بچێتە ناو ئافرەتەکان باخێزانی خۆشی لێبێت یەکسەر پۆلیس بانگی ئە کات و ئە ڵێت وەرە دەرەوە حەرامە جا کە پێغەمبەر ئەمەی فەرموو دەرگایەك تەرخان کرا بۆ ئافرەت جا، نافع ڕەزای خوای لێبێت ئە فەرمویێ: لەو کاتەوەی کە عبداللە کوڕی عمر لەو دەرگایە نەچووە ژووری مزگەوتەوە تا وەکوو مرد[٦]. ئە گەر ئافرەتانیش لەمزگەوت بوونایە لە ڕیزەکانی دواوە دەبوون منالأنیش لە پێشیانەوە و پیاوانیش لە پێش منالأنەوە بوون پیاوانیش بە امام و مەئموومیانەوە بۆیان نەبوو لە دوای سەلام دانەوە لەشوێنی

---

[٦] صحیح سنن ابی داود . ( ٤٦٤ ) رواه البخاری .

خۆیـان هەڵبستن و بچنه دەرەوه هـەتنا ئافرەتـان ئـه ڕۆیـشتن و ئـه گەڕانەوه ماڵەوه، بۆئەوەی تێکەڵی یەکتری نەبن.
**پێنجـەم:** ئـەبوو داود( ڕەحمەتی خوای لە سەربێت) لـه (سـنن)ەکـەی لەژێر سەردێڕی (باب إنصراف النساء قبل الرجال من الصلاة ) فەرموودەیەك دەگێڕێتەوه ( أم سلمه ) دایکی بڕواداران (ڕەزای خوای لەسەربێت) فەرموویەتی(كان رسول الله (صلى الله علي وسلم ) إذا سلم مكت قليلاً و كانوا يرون ذلك كميا ينفذ النشاء قبل الرجال )[٧] پێغەمبـەری خـوا ( صـلی الله علیـه وسـلم ) کاتێـك لـه نوێـژ سـەلامی ئەدایـەوه کـه مێك ڕائەوەسـتا، بۆ ئـەوەی ژنـان لـەپێش پیاوان دا بـچنه ماڵــەوەو تێکــەڵی لــه بەینیانــدا ڕوونــەدات. هــەروەها فەرموودەیەکیشمان لـه (أم سلمه)وه دایکـی ئیماندارانـەوه بـۆ ئـه هێنێتـەوه کەئەفـەرمووێت( كان يسلم فينصرف النساء فيدخلن بيوتهن من قبل أن ينصرف رسول الله (صلى الله عليه وسلم )واته که پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئاوڕی ئەدایەوه، ئافرەتـان یەکسەر دەستیان دەکرد بە چوونە دەرەوەو مزگەوتیان بە جێ ئەهێـشت و ئەچـوونەوه مـاڵی خۆیـان، دوای ئافرەتـان کـه ئەگەیشتنەوه ماڵە کانی خۆیان. ئەنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵئەسـتا لەمزگـەوت ئەچـووه دەرەوەو پیـاوانیش بـەدوای خۆشەویستدا دەستیان دەکرد بە چوونە دەرەوه، ئەمە لەبەر ئەوە بوو تێکەڵی لەبەینی پیاوان و ئافرەتاندا ڕوونەدات.

---

[٧] صحيح سنن ابی داود . ( ١٠٤٠ ) رواه البخاری .

**شەشەم:** النسائی بۆمان ئە گێڕێتەوە ئە فەرمووێت ( ئافرەتان کە سەلامیان دایەوە ئە ڕۆیشتنەوە، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم) لە شوێنی خۆی هەڵ نەئەستا، پیاوانیش چەندیان بویستایە هەڵ نەئەستان واتە پیاوانیش چەندیان بویستایە نزاو پاڕانەوەیان ئەکرد. جا کەپێغەمبەر هەڵئەستا، پیاوانیش هەڵئەستان و ئەڕۆیشتنەوە. (الحافظ إبن الحجر) ئەفەرموێت: (ئەو فەرموو دەیە بەڵگەیە لەسەر تێکەڵ نەبوونی ئافرەتان بە پیاوانی نامەحرەم لەسەرجادەو کۆڵان و بازاڕو شوێنە گشتییەکان حەرامە مەگەر لە بەر ناچاری نە بێت.

**حەوتەم:** لە(أم حميد الساعيديه)وە ئافرەتێکە چۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) ووتویەتی: (ئەی پێغەمبەری خوا حەزئەکەم نوێژ لە گەڵ تۆدا بکەم ) پێغەمبەریش فەرموویەتی (قد علمت أنك تحبين الصلاة معی، وصلاتك في بيتك خيرُ لكِ من صلاتك قي حجرتلِ، خيروٌ لك من صلاتك في داركِ، وصلاتك في داركِ خيرٌ لكِ من صلاتكِ في مسجيد قومكِ خيرو لكِ من صلاتكِ في مسجدي )[8] واتە: بەدڵنیایەوە ئەزانم حەزئەکەی نوێژ لە گەڵ مندا بکەی، بەڵام نوێژکردن لە ژورەکەی خۆتدا خێری زۆرترە لە نوێژکردن لە خانوەکەی خۆتدا، وە نوێژ کردن لە خانوەکەی خۆتدا خێری زیاترە وەك لە نوێژ کردنت لە مزگەوتی

[8] رواه احمد ژمارە ٢٦٥٥

گەڕەکەکەی خۆتدا، وە نوێژ کردنت لە گەڕەکەکەی خۆتدا خێرترە لەنوێژکردنت لە گەڵ منداو لەمزگەوتی مندا،بێگوومان ئەمەش لەبەر ڕوونە دانی تێکەڵیە لەنێوان پیاوانو ئافرەتان دا، هەروا چەند ڕێگای مزگەوتەکە دووربێت، ئەوەندەش گێچەڵی خوا نە ناسان زۆرتردەبێت.

**هەشتەم:** (عبدوڵای کوڕی عمر) ڕەزای خوای لەسەربێت بۆمان ئە گێڕێتەوە ئە فەرموێ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی ((لاتمنعوا النساء أن یخرجین إلي مساجد و بیو تهن خیر لهن))[9] ئافرەتان قە دەغەمەکەن لە چوونیان بۆ مزگەوت بەلاّم ماڵە کانیان بۆ ئەوان باشترو خێرترو سەلامەت ترن.

**نۆیەم:** ئەبو هریرە رەزای خوای لێبێت ئە گێڕێتەوەو ئەفەرموێت پێغەمبەر فەرمویەتی ( خیرٌ صفوف للرجال أُ ولها و شرها آخرها و خیر صفوف للنساء آخرها و شرها أولها ))[10] واتە باشترین نوێژی جەماعەت لە ڕیزی پیاواندا ڕیزی یەکەمیانە و خراپ ترینیشیان دوایەمینیانە، باشترین ڕیزی ئافرەتانیش دوایەمینیانەو، خراپتریشیان یەکەمیانە، ئەمە لە مزگەوتێك دا کە شوێنی ژنو پیاو جیانە بێت لەو مزگوتەدا ژنو پیاو بەیەکەوە نوێژی جەماعەت بکەن. هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد لەکاتی بەندایەتی و خواپەرستیایەو لەو حاڵەتانەیان کە موسڵمان زۆر

[9] رواە بخاری ۹۰۰،مسلم ٤٤٣

[10] مسلم ٤٤٠

خۆی بەدوور ئەگریٚ لەخراپەکاری و مەکرو حیلەکانی شەیتان.
ئەی ئەبێت لەبوارەکانی تری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و.........هتد. کە هەمیشە لەم بوارانەدا ڕۆژانە ژن و پیاو تێکەڵی یەك ئەبن ئە بێت چۆن بێت.

**دەیەم:** إبن عباس (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرمویٚ: (لەنوێژی جەژنی ڕەمەزان لەگەڵ پێغەمبەرو ئەبوبکرو عثمان دا بووم نوێژەکەیان پێش خوتبە خوێندنەوە کە کرد ئینجا دوای خوتبە خوێندرایەوەو پێغەمبەر دەرچووە دەرەوە بینیم بەدەستی خۆی پیاوانی دادەنیشاندەوە، تائافرەتان تێبپەڕن و بگەنە ماڵەوە و لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ نەبن). هەروەها لەڕیوایەتی مسلیم دا هاتووە کە ئەفەرموێت: (یجلس الرجال بیده) واتە: پێغەمبەر بەدەستی خۆی پیاوانی دادەنیشاندەوە بەئیشارەت خەڵکەکەی تێئەگەیاند تا ئافرەتان تێبپەڕن و بچنەوە ماڵەوە و لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ نەبن.

**یانزەیەم:** یە کێ لەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیە وسلم) بەیعەتی لەسەر ئافرەتان وەر ئە گرت واز هێنان و خۆ دور خستنەوە بوو لە خۆ ڕووت کردنەوەو سفوری و لە بەر کردنی پۆ شاکی شەرعی هەروەك و لە فەرموو دەکەی (میمونة بنت روقیە ) دا هاتووە بۆ مان دەر ئەکەوێت کەوەختێ بەیعەتی بە پێغەمبەردا پێی فەرموو شەریك و هابەش بۆ خوا بڕیار مەدەو

دزیو زینامەکەو منالەکانت مەکوژەو بوختان بۆ کەس نەکەیت، لە کاتی مردنی خۆشەویستەکانیشدا هاوارو شیوەن و ڕۆ ڕۆ مەکە و جوانی لەشی خۆت بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرنە خەیتو پۆشاکی شەرعی لەبەر بکەیت.

دووانزەیەم: حەزرەتی عایشە دایکی ئیمانداران "ڕەزای خوای لێبێت" ئەفەرموێت: لەنوێژی عیشادا حەزرەتی جبریل ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر هێنایە خوارەوە کە ئەفەرموێت: (و لیضربن بخمورهن علی جیوبهن)[11] واتە ئەی خۆشەویستی خوا بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ کە خۆیاندا پۆشنو جوانی و ڕازاوەی خۆیان دەرنەخەنو لەچکەکانیان بەسەر سنگو سینەو گەردنیانا پەردەنەوە، حەزرەتی عایشە ئەفەرموێت (یرحمه الله نساء المؤمینات اول رحمة) ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتانی پێشینەی ئەم ئیسلامە بێت، کە وەختێك حەزرەتی جبریل ئایەتی (و لیضربن بخمورهن علی جیوبیهن)ی لەکاتی نوێژی عیشادا بۆ پێغەمبەر هێنایە خوارەوە، پێغەمبەریش یەکسەر بۆ صحابەکانی خوێندەوە، صحابەکانیش کەڕۆیشتنەوە یەکسەر بە ژنو منداڵەکانیان ڕاگەیاند، ئەفەرمویٚ ئافرەتیش هەبوو خۆی لە مزگەوت بوو گویٚ ی لیٚ بوو، حەزرەتی عایشە ئەفەرموێت:

---

[11] سورە الاعراف ( ٢٦ ).

وەلآهـی هـەر ئـافرەت بـوو ڕای ئـەکردەوە پارچـە قوماشـێکی ئەدۆزیەوەو خۆی پێدا ئە پۆشـی، بۆ نوێژی بەیانی کەهاتنـەوە بۆ مزگـەوت یـەك ئافرەت بەڕووتی نـە ئـەبینرا. بۆیـە ئەفـەرمووێ ڕەحمەتی خوا لەئافرەتانی پێشینەی ئەم ئیسلامە بێت هـەربیان وتایە خواو پێغەمبەری خوا(صلی الله علیـه وسلم)وا ئەفەرمویٚ: یەکسەر جێبە جێیان ئەکرد.

سـیانزەیەم: عمـری کـوڕی خطـاب (ڕەزای خـوای لێبێـت) بـە پێغەمبـەری خـوای فـەرموو (إحجـب نـسائك........... قالـت عایشة ، فأنزل الله آیـة الحجـاب)[12] ئـەی خۆشەویستی خـوا پیـاو خـراپ زۆرن بـا خێزانـەکانت خۆیـان دا پۆشـتن و جـلو بـەرگی شـەرعی لەبـەر کـەن، حـەزرەتی عایـشە ئەفـەرموێت دوای ئـەم قسەیەی حـەزرەتی عمـر خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی بـۆ نـاردە خـوارەوە (قل یأیهـا النبي قل لأزواجك و بناتـك ونـساء المـؤمنین بدنین علیهِن من جلابیبهن ذلك ادنـی أن یُعـرفن فلایـؤذین و کـان الله غفوراً رحیما )[134] واتاکەیمان لەپێشوتردا لێك داوەتەوە.

چـواردەیەم: هـەروەها حـەزرەتی عمـر ((ڕەزای خـوای لێبێـت)) ئەفەرمویٚ ( یارسول الله، لو أمرتَ أُمهات المؤمنین بالحجـاب فـأنزل الله آیة من الحجـاب ) ) ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگایە فەرمانت بە

---

[12] سورە الاحزاب ( ٥٩ ).

پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاک و کۆمەڵە ، احمد میرزا ڕۆستەمی ژێروو (٥٣)

دایکانی ئیماندار بکردایە پۆشاکی شەرعیان لەبەرکردایە، دوایی ئەم قسەیە یەکسەر خوای پەروەردگار ئایەتی پۆشاکی شەرعی ناردە خوارەوە و جلو بەرگی شەرعی لە سەر ئافرەتان فەرزکرد.

**سێیەم : هەڵوێستی صحابەکان لەو بارەیەوە:-**

خێزانی صحابەکان (ڕەزای خوایان لە سەر بێت) خۆیان لە تێکەڵبوون لە گەڵ برایانی صحابەدا زۆر بەدوور ئەگرت، هەروەها لە کاتی قەرە باڵغی مزگەوت و ڕێوڕەسمی حەج کردن لە (المسجد الحرام) دا خۆیان زۆر ئەپاراست، ئێستەش هەندێ لەو هەڵوێستانە دە خەینە بەر دەستی خوێنەرانی موسڵمان:-

أ- حەزرەتی عایشەی دایکی بڕواداران ( ڕەزای خوای لێبێت) لەکاتی تەواف کردندا خۆی لەپیاوان جیا دەکردەوە، لەو کاتەدا ئافرەتێك پێی ووت (إنطليقي نستلم يا أم المؤمنين) خێراکە، پەلەکە خۆت بگەیەنە بەردە ڕەشەکە، بڕۆبادەستی لێبدەین. فەرمووی (إنطلقي عنك) بەتوڕەییەوە فەرموی بۆ خۆت بڕۆ، نە چووەو تێکەڵی پیاوان نەبووە.

ب- ئافرەتێك هاتە لای حەزرەتی عائیشەو ووتی (ئەی دایکی بڕواداران، حەوت جار بەدەوری کەعبەدا سوڕامەوەو دووسێ جاریش دەستم لە بەردەکەدا حەزرەتی عائیشە پێی فەرموو: خوا پاداشتت نەداتەوە ، ئەم پاڵە پەستۆو شان بەشانەت لە گەڵ پیاواندا بۆ کرد، ئەی بۆچی (الله أكبر)ت نەدەکردو تێ نەدەپەڕیت، واتە: لەحەجی ماڵی خوادا کە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی ڕۆژی حەشر، ئا لەوێش دا باش وایە ئافرەتان خۆیان بە دور بگرن لە تێکەڵ بوون لەگەڵ پیاواندا و بەناویاندا

نەچن بۆ لای بەردەکەو دەستی لێبدەن، نەخێر هەر لەدورەوە دەستی بۆ هەڵبڕن باشترە لەوەی خۆیان لەپیاوان بخشێن و دەستی لێ بدەن.

ج- لەسەردەمی پێغەمبەردا ( صلی الله علیه وسلم) لە کاتی چوونە ژورەوەی کەعبەی پیرۆزدا، ئافرەتان ڕائەوەستان تا پیاوان ئە هاتنە دەرەوە، ئەنجا ئە چوونە ژوورەوە.

د- (إبراهیم النخعی) ئەفەرموێت: (ئیمامی عمر) ڕەزای خوای لەسەر بێت لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا نەیدەهێشت پیاو لە گەڵ وئافرەتانا بەیەکەوە تەواف بکەن، هەروەها ئەفەرموێت:(جارێکیان پیاوێکی بینی لەگەڵ ژنێکدا تەوافی دەکرد، ئمامی عمر بەقامچی لێیدا)[١٤]

**لقی سێیەم:ناوەکانی پۆشاکی شەرعی لەقورئانی پیرۆزدا:**

پۆشاکی شەرعی جل و بەرگ لەقورئانی پیرۆزدا بە چەند ناوێکی جۆراو جۆر هاتووە، لەوانەش:

**یەکەم: لباس:**

واتە: بەرگ یان پۆشاک کە بەمانای داپۆشینی شتێك دێت، لە زۆر ئایەتیش دا (لباس) بەمانای (کراسی زرێپۆشی) دێت (وعلمناه صنعة لبوس)[١٥] واتە فێری دروست کردنی ئەو جۆرە کراسانەمان کرد، هەروەها (لباس) لەقورئانی پیرۆزدا بەمانای

---

[١٤] پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاک و کۆمەڵە أحمد میرزا رۆستەمی ژێرو ٢٦٠
[١٥] رواه امام احمد و مسلم و کذلک النسائي في کتبهم

پۆشاك بوونی ژن‌و پیاو دێت كە خوای پەروەدگار ئەفەرموێت: ((هـنَّ لبـاس لكـم وانـتم لبـاس لهـن))[16] لێـرەدا بەمەبەسـتی داپۆشینی مەعنەوی دێت: ((یابنی ادم قد أنزلنا علیكم لباساً یواری سوء اتِكم وریشاِ ولیباسُ التُقوی ذلك خیرُ ذلك مِن آیات اللهِ))[17] واتە ئەی نەوەكانی ئادەم ئێمە بەرگمان بۆ ئێوە درووست كـردووە تـاوەكو لاشـەتان داپۆشـێ، بـەڵام بـەرگی خواناسـی باشترو جوانترە بۆ ئێوە.

دووەم: خمار:

واتـە سـەرپۆش خـوای گـەورە ئەفـەرموێت (ولیـضربن بجمـورهن علـی جیـوبهن)[18] واتـە ئـەی پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـە وسـلم) بـە ئـافرەتی ئیمانـدار بڵـێ: بابەسەرپۆشـەكانیان مـل‌و سنگ‌و گەردنیان دا پۆشن.

سێیەم: جلباب:

واتـە كراسـی ئاودامـان یـان ئـەو بەرگـەی كـە هـەموو لـەش دادەپۆشێت جگە لە هەردوو دەست‌و دەموو چاو وەك‌و خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ((یَا أَیُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِینَ یُدْنِینَ عَلَیْهِنَّ مِنْ جَلابِیبِهِنَّ ذَلِكَ

---

[16] امام احمد لە ژێر ژمارەی (٥١١٤،٥١١٥،٥٦٦٥) و ابن عساكر گێڕاویانەتەوە .

[17] رواه مسلم و النسائي و الدارمي وابن خزيمة والبیهقي واحمد .

[18] سورة الاعراف٢٦

أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً))[19]. واتە ئەی پێغەمبەری خوا پێغەمبەردا (صلی الله علیە وسلم) بەخێزانو کچەکانو ئافرەتانی ئیماندار بڵێ جلو بەرگی شەرعی لەبەر بکەنو جوانیو ڕزاوەی خۆیان بۆ پاوانی نامەحرەم دەرمەخەن چونکە ئەو پۆشاکە ناسنامەی باوەڕداریانەو لەهەموو زیانو ئازارێك ئەیان پارێزێت خوای پەروەردگاریش لەگوناهەکانت خۆش دەبێت و بەڕەحمو بەزەییە بەرامبەر بەبەندەکانی خۆی (الجلابیب) کۆی( جلباب)ە لەسەر ڕیوایەتی (ابن عباس) بریتیە لەو پۆشاکەی کە ئافرەت بەسەر خۆیا ئەدات و لەسەرەوە تاخوارەوەی خۆی پێ دائەپۆشێت، هەروەها لەتەفسیری (ئالوس) و (البغویش)دا بەمانای ئەو پۆشاکە هاتووە کەئافرەت لەسەر هەموو جلەکانیەوەلە بەری ئەکاتو خۆی پێدا ئە پۆشێ،واتە (الجلباب) ئەو پۆشاکەیە کەهەموو لەشی ئافرەت دا دە پۆشێت.

**چوارەم: ثیاب:**

ئەم پۆشاکە تایبەتە بەو ئافرەتانەی کەسوڕیی مانکانەیان بەسەرچووە واتە منداڵیان نابێت، ئامادەی شوکردنیان نەماوە سەرتاپا واتە داپۆشراویان لەسەر گوناحو تاوان نیە، بەمەرجێك

---

[19] سورة الاحزاب ٥٩

**ئەو ئافرەتانە جوانیو ڕازاوەی خۆیان بەلابردنی ئەو سەراپا پۆشتەیەیی بەدەرنەخەن. ئەگەر خۆشیان سەراپا داپۆشن زۆ باشترو چاکترە بۆیان.**

# بەشی دووەم

## یەکەم: مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی:-

خوای گەورە لە بارەی ئافرەتانەوە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی (ولا یبدین زینتهن) باجوانی و ڕازاوەی خۆیان دەرنەخەن، بەلاّم بۆ پیاوان ئەوەی فەرمووە، ئەمەش بۆ سودو سەربەرزی و سەرفرازی ئافرەتە، بۆ کۆت و زنجیرکردنی ئافرەت نیە وەك و بێباوەڕان و خوانەناسان وادەڵێن ئەم خۆداپۆشینە ئەوە ئەگەیەنێت کەجوانی وڕازاوەیو ناسکی هەمیشە لەئافرەتان زۆر ترە وەك و لەپیاو، بەڵێ بۆ پاراستنی ئەو جوانی یەو پتەو کردنی بناغەی کۆمەڵگای موسڵمان نەپچرانی شیرازەی کۆمەڵگا، بەرگری کردن لە بلاّو نەبوونەوەی خراپەرکاریو داوێن پیسیو بۆگەن نەبوونی کۆمەڵو لەناو نەچوونو دانەڕزاندنی کۆمەڵگاخوای پەروەردگار پۆشاکی لە سەر ئافرەتان فەرزکردووە، ڕەحمەت لە پێشینانی ئەم میللەتە بێت کە فەرموویانە: (ماسی لەسەریەوە بۆگەن دەکات) دەی لای هەموانیش شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵن بەڵکو ئەڵێن سەری هەموو کۆمەڵێکن، واتە ئەگەرئافرەت پیسو بۆگەن بوو ئەوا ئەو کۆمەڵەش هەمووی پیسو بۆگەن ئەبێت، کەواتە بەفرێدانی پۆشاکی شەرعی ئەو

هەموو خۆڕازاندنەوەو زەرق و برقیەی کە ئیستا ئافرەت ئەیکا کۆمەڵگا بەرەو ڕووخان و خرپەکاری ئەبات، زۆر بەداخەوە، خوشکمان هەیە ناتوانێ دەست بەرداری ڕووتی و قووتی بێت، زۆر خوشکیش بەتایبەتی ئەوانە کە هەندێ ئیلتیزامی دینیشیان هەیە واتە نوێژ ئەکەن و ڕۆژوش ئەگرن، زەکات ئەدەن، ڕووکنەکانی تریش جێبە جێ دەکەن کەچی ڕوت و سفورن و تەنیا بۆ مانگی ڕەمەزان خۆیان دا ئەپۆشن و دوای ڕەمەزان ئەگەڕێنەوە سەر باری جارانیان کە لێشی ئەپرسی خوشکی بەڕێز بۆ وا ئەکەی بۆ ئەچیتەوە سەر ئەو نەریتەی گرتوتە، لە وەلاًم دا ئەڵێت بە دڵە بە جل نیە یان ئەڵێت جارێ گەنجم با پیرببم شوم نەکردووە باشو بکەم، ئاخر خوشکی بە ڕێزم بەم بێ فەرمانیەت خوا تورە ئەکەی و شەیتان و دوژمنانی خوا دڵخۆش ئەکەی دڵنیاش بە سەرەنجام دا دەڕزێ و پیس و بۆگەن دە بێت، داواکارم لەخوای پەروەردگار و لێی ئە پاڕێمەوە بۆخاتری ناوە جوانەکانی خۆی و سیفەتە بەرزوو بالاًکانی خۆی، ئەم نەریتە لەدڵی خوشکانمان دەربێنێت، بەڵێ دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین کە خوای گەورە یەك شێوەو یەك مۆدێلێ پۆشاکی لە سەر ئافرەتان فەرز نەکردووە ناچاری نەکردوون کە یەك ڕەنگ و یەك شێوە بپۆشن، نەخێر بەڵکو ئافرەتان خۆیان ئازادن لە هەڵبژاردنی شێوەکەی و. ڕەنگەکەی، بەمەرجێ ئەو پۆشاکە لەمەرجەکانی پۆشاکی شەرعی بێت، چونکە شێوەی

مۆدێـــل و ڕەنگـــی پۆشـــاك لەكاتێكـــەوە بـــۆ كـــاتێكی تـــر لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر لەمیلەتێكەوە بۆ میلەتێكی تر دەگۆڕێت، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە كە باسی پۆشاكی شەرعی ئەكەیت زۆركەس وا ئەزانێت پۆشاكی شەرعی تەنیا حیجابە نەخێر هیچ دەقێك نە لە قورئانو سوننەتەكانی پێغەمبەرا (صلی الله علیه وسلم) نەهاتووە كە ئافرەتان ناچاربكا تەنیا یەك ڕەنگ و یەك شێوە لەبەركەن)[٢٠] ئەمەش واتای ئەوە نیە كەئافرەت هەر جلو بەرگێك لە بەربكا ئیتر تەواوە ئەو پۆشاكە شەرعی یە نە خێر بەڵكو ئەبێت ئەو پۆشـــاكەی كـــە ئافرەتـــان لەبـــەری ئەكـــەن بەتـــەواوی لەگـــەڵ مەرجەكانی پۆشاكی شەرعیا یەك بگرێتەوە. بۆ زیاتر ڕوون كردنـــەوەی باسـەكەشمان لـە خـوارەوە مەرجـەكانی پۆشـاكی شەرعی لەچەند خاڵێكا ڕوون ئەكەینەوە:

یەكەم: ئەبێت پۆشاكی شەرعی ئاو دامان بێت واتە بالاّ پۆش بێتو هەموو گیانی دا پۆشێت لەسەریەوە هەتاوەكو قاچەكانی، واتـــە نابێـــت هـــیچ بـــە شـــێكی لەشـــی والأكاتـــەوە بـــۆ چـــاو چنۆكانوچـاو برسـیەكان تـاتیری ژەهـراوی خۆیـان تێبگـرن بەفەرموودەی خوای پەروەردگار كە ئەفەرمووێت(يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) واتە: بائافرەتانی ئیماندار جلی شۆڕو ئاودامان

---

[٢٠] پۆشاكی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاك و كۆمەڵە أحمد میرزا رۆستەمی ژێرو ٥٣

لەبەرکەن بە خۆیاندا شۆڕی بکەنەوە تا بەتەواوی هەموو لەشیان دادەپۆشێت.لەبەرچاوی ئەو پیاوانەی کە مەحرەمی خۆیان نین، شۆڕکردنەوەش لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە ئەوەندە شۆڕبێت لەدوای خۆیدا بەزەویدا بخشێت وپیسی وپۆخڵییەکەی زەوی رابماڵێتو لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت،عکرمەش(رەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەو پۆشاکەی کەئافرەتانی ئیماندار بەسەر خۆیاندا ئەدەن دەبێت تەختی سینگ وگەردنیان داپۆشێت کەواتە: یەك لەمەبەستەکانی پۆشاکی شەرعی ئافرەتانی ئیماندار ئەوەیە هەموولاشەی داپۆشێت بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوانی نامەحرەم بۆ لای خۆی ڕانەکێشێت دەرگای تاوان نەکاتەوە ، چونکە پۆشاکی شەرعی ئەندامەکان ئەشارێتەوە.

**دووەم:** ئەبێت پۆشاکی شەرعی ئەستوور بێت، واتە ئەبێت ئەو پۆشاکە ئەوندە ئەستوور بێت لەش تیا دەرنەکەوێت، ئەوەندە تەنك وروون نەبێت گیانی ئافرەتی تیا دەرنەکەوێت، ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لەسەربێت) ئەفەرموێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا بەرگێکی (قبطي ) پێدام کە(دحیە کلبی) بە دیاری پێشکەشی پێغەمبەری کردبوو، منیش دام بە خێزانەکەم دوای چەند ڕۆژێك پێغەمبەر فەرمووی: بۆ بەرگە قبتیەکەت لەبەر نەکردووە؟ ئوسامە ئەفەرمێت منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا داومە بەخێزانەکەم، فەرمووی: بەخێزانەکەت بڵێ: با لەژێرەوەی ئەم بەرگە جلێکی کە لەبەر بکات نەوەك ئەم بەرگە قەبارەی لەش

ولار وئێسکەکانی بەدەر بخات و وێنایان بکات لەبەر چاوی خەڵکی . لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرگیز پۆشاکی تەسک وتەنك و تەنگەبەر دروست نی یە، ئەگەر خۆمان لە ڕاستیەکەی لانەدەین هەموومان ئەزانین پۆشاکی تەسك و تەنك قەبارەی جەستەو ئەندامەکان وێنا ئەکات هەم پێستی لەشی تیا دیارە ، بۆ یە ئەبێت ئافرەتانی ئیماندار وشیار بن و خۆیان لەو جۆرە جل وبەرگە بپارێزن ، چونکە ئەو جۆرە پۆشاکەی ئەمڕۆ لەبەر ئەکرێت پۆشاکی مسوڵمان نی یە چ پیاو چ ئافرەتیش ، بەداخەوە ئەمڕۆ پیاوانیش ئەوەندە جلی تەسك وتەنك لەبەر ئەکەن زۆر لە هی ئافرەتان خراپترە ، زۆر جار وتوویانە مامۆستا ئەو گەنجانەی کە لە ڕیزەکانی پێش ئێمەوە نوێژ ئەکەن کراس وتیشێرتەکانیان ئەوەندە کورتە هەموو لەشی بەدەر ئەکەوێت . یان زۆر جار پیاو لە بازاڕ وکۆڕ ومەجلیسەکان ئەبینی شەرم لە خۆت ئەکەیت، ئەم سیفەتی ئەهلی بەهەشت نی یە ئەگەر ئەتەوێت بچیتە بەهەشت ئەبێت پابەند بیت بە فەرموودەی خوا وپێغەمبەری خوا . ئەم سیفەتە خراپانە واز لێبهێنێت و بچێتەوە سەر ڕێبازی قورئان وسووننەت .

حەزرەتی عایشە دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێبێت) ئەیگێڕێتەوە کە (ئەسما) کچی ئەبوبکر هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) جلێکی تەنکی لەبەر دا بوو، پێغەمبەر ڕووی لێوەر گێڕا وفەرمووی ((ئەسما و ئافرەت ئەگەر

بالغ بوو گەیشتە تەمەنی بێنوێژی بۆی نی یە هیچ شوێنێکی بەدیارەوە بێت بیجگە لێرەو لە وێی نەبێت واتە ئیشارەتی کرد بۆ هەردوو لەپی دەست ودەم وچاوی )[21]

**سێیەم:** ئەبێت پۆشاکی شەرعی فراوان بێت: ئەبێت پۆشاکی شەرعی فراوان بێت وتەسك وتەنك نەبێت بەشێوەیەکی وا کە لەش ولار و شوێنە بزوێنەرەکانی تیا دیار بێت و وێنەی ئەندامەکانی لەشی بەرجەستەو قۆقز دەرنەپەڕێنێت و وێنای لەشی بکات، هەندێ جل و بەرگ هەن کە درێژو ئاو دامانن بەلاّم تەسك وتەنکن هەموو سەر سینگ ومەمك و نێو قەد سمتەکانی دەردەپەڕێنێت، هەروەها جاری وا هەیە یەخەکانیان فراوان ئەدوورن بەلاّم نیوەی پشتیان لە دواوە دیارە یان سەرسینگ و مەمکیان بەدەر ئەکەوێت ، بەڕاستی لەبەرکردنی ئەوجۆرە جل وبەرگانە حەرامە : چونکە سەرنجی نەك هەر گەنج ولاو هەرزەکاران بەڵکو پیرەکان وبەساڵا چوانیش بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن و سەرەنجام خراپەو بەرەڵاییش بڵاو ئەکەنەوە، هەروەها ئەو تەنوورەو چاکەتانەی کەئەمڕۆ ئافرەتان لەبەری ئەکەن جاری وا هەیە چاکەتەکە زۆر تەسکە وبەشی پێشەوە و دواوەی لەشی دەر ئەپەڕێنێت یان تەنوورەکەی لە دواوە

---

[21] ئەم فەرمودەیە (بخاري و مسلم و ابو داود و النسائي و ابن ماجە و مالك و احمد و البیهقي و ابن حزم) لە (عبدالله کوڕي عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە .

شەقێکی تیایە ونیوەی قاچی بەدەر ئەخات ئەمەش حەرامە، بەڵام ئەگەر تەنوورەکە ئەوەندە فراوان بێت لەشی دەرنەپەڕێنێت و چاکەتەکەی تەسك وکورت نەبێت و پێشەوەو دواوەی بەتەواوی داپۆشێت، بلوزەکەی ئەوەندە تەسك لەبەر نەکات کە مەمکەکانی دەرپەڕێنێت، سەرپۆشی شەرعیانەیان لەگەڵدا لەبەر کات و سەرپۆشەکەش تا ناوەڕاستی پشتی بچێت وسەر ومل وشانی لەدواوە داپۆشێت و لەپێشەوەش سەر سینە وسینگ ومەمکەکانی داپۆشێت لەبەرکردنی باشترە لەجۆرەکانی تر .هەروەها لەبەرکردنی پانتۆڵ وشانتۆڵ وسترێژ بەهیچ شێوەیەك شەرعی نی یەو دروست نی یە لەبەرکردنی ، چونکە هەر لەبنەڕتدا ئەوە جل وبەرگێکی ڕۆژئاواییە وئافرەتان بەدیاری بۆیان ناردووین ، بێجگە لە قینە وفەسادی هیچ سیفەتێکی شەرعی تیا نی یە. هەندێك لەخوشکان دەڵێن پرسیارمان کردووە وە مامۆستایان وتوویانە ئەگەر چاکەتی درێژی لەگەڵ لەبەرکەن و پاش وپێشی دابپۆشێت ڕەوایە ودروستە، ئێمەش لەوەڵامی ئەو خوشکانەو هەموو ئەوکەسانەی بەو شێوەیە بیر ئەکەنەوە ئەڵێین ئەوکاتە دروستە ئەگەر فراوان بێت و پانتۆڵەکە هیچ شوێنێکی دیار نەبێت ، ئەو پۆشاکەی کەلەسەر پانتۆڵەکەوە لەبەر ئەکرێت ئاودامان وفراوان بێت تەسك وتەنك و تەنگەبەر نەبێت وەسفی پانتۆڵ و جەستەشی نەکات، ئەگەر بتەوێت زۆر شەرعی تر بێت ئەبێت عەبای لەسەرەوە لەبەر

بکەیت، هەموو لەشی لەسەرەوە تا خوار قاچەکانی دابپۆشێت لەگەڵ ڕێزمان بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزانەی ئەو جۆرە فتوایەیان داوە ئەگەر بەشێك لە ئافرەتانیش ئەوەیان کردۆتە بیانو پانتۆڵ لەبەر ئەکەن پارچە پەڕۆیەکیش بەسەر پاش و پێشی خۆیاندا داوە گوایە کە پۆشاکی شەرعییان لەبەردایە ، توخوا من لەخۆتان دەپرسم کەی ئەوە سەرپۆشە و کەی ئەوە پۆشاکی شەرعییە و کەی پۆشاکی شەرعی وەك ئەو پۆشاکەیە کە بەڕێزت پۆشاوتە.

ئەگەر ڕاست ئەکەیت ئەتەوێت پۆشاکەکەت شەرعیانە بێت و وەك وئافرەتانی سەردەمی چەرخی زێڕینی ئیسلام بێت و وەك و خوا فەرمانی پێ کردووە ئەبێ لەسەروو هەموو جلەکانتەوە عەبا بەخۆتا بدەیت و هەر لەسەر تەوە تا ئەگاتە پێیەکانت داپۆشێت ، بێجگە لەمانەش پانتۆڵ بەزۆری بۆ پیاوانە ئەگەر بۆچوونەکەشمان ڕاست بێت ئەوە لێرەشدا خۆ چوواندنە بە پیاوان ، پێغەمبەری خواش ( صلی الله علیه وسلم) نەفرینی لەوپیاو وژنانە کردووە کە خۆیان بە یەکتری دەچوێنن ، هەروەها پانتۆڵ بەو سیفەتەی کە ئێستا بەتەسکی وتەنکی لەبەر دەکرێت بۆ پیاوانیش دروست نی یە گوناهێکی گەورەیان دەگاتێ، چونکە هەموو لەشیان پێشەوە وپاشەوەشیان قۆقز دەردەپەڕێت.هەروەها جارێکیان کۆمەڵێك ئافرەت هاتنە لای حەزرەتی عائیشەی دایکی ئیمانداران ( ڕەزای خوای لە سەربێت) جلی تەنکیان لەبەردابوو، حەزرەتی عائیشە فەرموی ئەگەر ئیماندارنو باوەڕتان هێناوە ئەوە ئەو جلوبەرگەی لەبەرتانایە

ب: ئەوکەسەی کەماڵو منداڵەکەی لەسەر بەرەڵای و خراپەکاری پەروەردە دەکات و پێشی ڕازیە، لێرەدا ئەو کەسانەش ئەگرێتەوە کە کچو ژنو خوشکەکانیان خۆیان ئەڕازێنەوەو خۆ سفور ڕووت ئەکەنەوەو پێشی ڕازی یە.

ج: ئەو ژنانەی کە خۆیان بەپیاوان ئەچووێنن و ئەو پیاوانەش کەخۆیان بەژنان ئەچوێنن، ئەوسێ کەسە ناچنە بەهەشتەوەو بۆنیشی ناکەن هەتا تەوبە نەکەن واز لەوکارەیان نەهێنن.

٣- وعن عمار بن ياسر (رضى الله عنه) عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال ثلاثة لايدخُلون الجنةَ أبداً: الدَّيوثُ، و الرجُلةُ مِن النساء، و مد مِنُ الحخمر. قالوا: يارسول الله أَما مد من المخمر فقد عرفناه، فما الدَّيوثُ؟ قال : الذى لايُبالي منَ دَخلَ على اهلِه فقلنا: فَما الرَّجُلةُ مِن النساء؟ قال التنى تشبه بالرجل)) عماری کوڕی یاسر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێت پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) فەرموی سێ کەس هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە

أ: ئەو کەسانەی کە ماڵو منداڵیان هەرچی ئەکەن و هەرچی بێفەرمانی خواو پێغەمبەرە ئەیکەن دەنگ ناکات و لێپچینەوەیان لەگەڵا ناکات پێی ڕازییە.

ب: ئەو ژنانەی کە لاسای پیاوان دەکەنەوە چ لە پۆشاکو جلو بەرگ چ لە هەڵسوکەوتو چ لە خورەوشت و ئەخلاقو چ لە قژبڕینو کورت کردنەوەو دەنگ زڕکردن وەکو پیاوان هەروەها

بە پێچەوانەشەوە پیاوانیش وەك و ژنیان بكەن لە جل و بەرگ و پۆشاكیا لە هەڵسوكەوتیا لەخۆڕەشتو ئەخلاقا لە دەنگ ناسك كردنەوەو خۆبادانا

ج: ئەو كەسانەی كەوا ژن بن یان پیاو فەرقی نیە كە بەبەردەوامی عەرەق ئەخۆنەوە لەگەڵ خوێنیان تێكەڵ بووە واتە (مدمن) بوون لەگەڵی ڕاهاتوون، صحابیەكان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم) ئەوەی كە عەرەق خۆرە ئەزانین كێیە بەلأم ئەی ( الدیوث) چی یە؟ فەرمووی ئەو كەسەی هەركەسێك بێتە لای ماڵو منداڵی گوێی لێنیەو خۆی سڵ ناكاتو پیێ ی ڕازیی یە، وتیان ئەی ڕەحمەت نەبێت (الرَّجُلَةُ مِن النساء) چیە؟ فەرمووی ئەو ژنانەی كەخۆیان بەپیاوان ئە چوێنن. وە( الدیوث ) واتە گەواد، ئەو كەسەی كە سەری خۆی لەئاستی بەرەلأی و بێ ئەخلاقی ماڵو منالیا شۆڕئەكاتو قسەناكات.

**پێنجەم:** جل و بەرگی لە خۆبایبوون نە بێت ( الشهرە) نە بێت جل و بەرگ و پۆشاكی شەرعی بۆ خۆدەر خستن و ناوبانگ نە بێت،بۆ خۆ هەڵ برین بە سەر خەڵكی دا نە بێت، لاف گەزاف و فیزیان بەسەرەوە لێ بدات، مەبەست لە جل و بەرگ و پۆشاكی شهرە ئەو كەسەیە كە جل و بەرگی گران بەهاو جیاوازو ڕازاوە لەبەر بكات بەمەبستی خۆ هەڵ برین و خۆ جیاكردنەوە لە خەڵك ئەمەش واتای ئەوە نیە كە جل و بەرگی كۆن و شڕو دڕوو چڵكن لەبەر بكات بەناوی دینداری و زوهدەوە! نە خێر بەڵكو (خیر

الأمور أوسطة) باشترین کار ئەو کارەیە کە مام ناوەندی بێت نە زیادە ڕەوی تێدا بێتو نەکەموو کوردتی ( الأفراط و التفریط) یان تاکە ڕەنگێك لە بەر بکات کە لە ناو بازاڕدا تاك بێتو دەگمەن بێتو پێیەوە بنازێت. إبن عمر ڕەزای خوای لە سەر بێت بۆ مان ئە گێڕێتەوە و ئەفەرموێت ( عن إبن عمر (رضی الله عنه) یرفعه قال: من لبس ثوب شهرةٍ اَلبَسٌ الله إیاه یوم القامة، ثمً الهب فیه للنار، ومن تُشبَهَ بقوم فهو مِنهم، ذکر رزین في جامعه. بەلآم ( إبن ماجه) بە سەنەدێکی ڕاست گێڕاویەتەوە. (قال: قال (رسو الله (صلی الله علیه وسلم) من لبس ثوبَ شهرة في الدنیا اَلبَسهُ الله ثوبَ مُذَلَةٍ یوم القیامة، ثمً الهبَ فیه ناراً) ئەفەرموێ پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێ جلو بەرگی بەناو بانگی بۆ خۆدەرخستن لە دونیادا لەبەر بکاتو خۆی پێوە ڕاوەشێنێو فیزی پێوە لێبدا بەسەر خەڵکا ڕۆژی قیامەت هەمان جلوبەرگی لەبەر ئەکرێتەوە و گڕیی ئاگریشی تێبەر ئەدەن، هەرکەسێکیش خۆی بەهەر گەلو کۆڕو کۆمەڵو کەسێك بچوێنێت ئەوە ئەو کەسە لەوانەو حەشرو حەقو حیسابیشی لەگەڵ ئەوان دایە.

**شەشەم:** پۆشاکی شەرعی ئەبێت پۆشاکی ئافرەتانی کافرنەبێت نابێ پۆشاکی ئافرەتی موسڵمان لە پۆشاکی کافران بچێت، چونکە لەبنچینە و بنەما گرنگە کانی شەریعەتی ئیسلام ڕێگە نەدانە بەئافرەتی موسڵمان کە خۆی لەپیاو ئافرەتانی کافران

بچوێنێ. جافەرقی نیە ئەو خۆ چواندنە لە جل‌و بەرگ‌و پۆشاك دا بێت یان لە دابوونەریت‌و جەژنەكاندا بێت یان لەبەندایەتی پەرستشەكاندابێت، بەڵگەشمان ئەم فەرموودەیە یە كە عبدالله كوریی عاص گێراویەتیەوە ئەفەرموێت : ( رأى رسوالله صلى الله عله وسلم عليَّ ثوبين معصفرين فقال: هذه من ثياب الكفار فلا تلبسهما )[٢٣] وە لە فەرموودەیەكی ترا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:( .......... ومن تشبه بقومٍ فهو منهم)[٢٤] شێخی ئیسلام (إبن تيمە) لەسەر ئەم فەرموو دەیە ئەفەرموێت (ئەم فەرمودەیە هێواشترین و هێمن ترین فتوای ئەوەیە كە فەرمان دەكات بە خۆ نەچواندن بە كافران. هەر واتای رواڵەتی فەرموودەكەش كوفركردنی خۆچوێنەر بە كافران دەگەیەنێت. هەروەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێت ( ومن يَتَّولهُمْ مِنهم فأَنَّه مِنهُمْ) هەركەسێك لە ئێوە بەدوای كافران بكەوێت، یان خۆی بچوێنێت یان مەیلی ئەوانی هەبێت و لایەنگیریان بكات ئەوە بە هەموو واتایەك ئەو كەسە لەوانە . هەروەها (الصفانی) ئەفەرموێت ( ئەم فەرموو دەیە ئەوە ئەگەیەنێت هەركەسێك خۆی لە فاسق و كافرو خراپەكاران بچوێنێت ئەوە لەوانە، ئەوە پێی كافر ئەبێت، بەلام ئەگەر بروای وانەبوو ئەوا زانایان رایان

---

[٢٣] رواه امام أحمد ومسلم وكذالك النسائي في كتبهم

[٢٤] رواه امام احمد لە ژێر ژمارەی (٥٦٦٥،٥١١٥،٥١١٤وابن عسلكر گێراویانەتەوە) .

جیاوازە لەبارەیەوە، هەندێك فەرمویانە كافر ئەبێت و پیشتیان بەڕواڵەتی فەرموودەكە بەستوە.هەندێكی تریشیان فەرموویانە كافر نابێت بەڵام دەبێت سەر زەنشت بكرێت و پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە سەر بەرنامەی ئیسلام و واز لەو ڕەوشت و خۆجواندنە بێنێت .

## دووەم: بەڵگە كانی بەدەر خستنی دەم و چاو:

خوێنەرانی بەڕێز لەم بەشەی باسەكەماناجەزئەكەم ئەم بەڵگانە باس بكەم كە ڕێگەئەدەن بەدەرخستنی دەم و چاو بێگومان زۆربەمان دەزانین كە عەورەتی پیاو لە نوێژدا لە نێوان ناوك و هەردوو ئەژنۆیەتی، هی ئافرەتیش هەموو گیانیەتی، هەرچەندە لە نێوان زانایانی ئیسلام دا جیاوازیان كردووە لەم مەسەلەیەدا. زانایانی سعودی وتویانە :هەموو گیانی ئافرەت عەورەتە (شێخ ناصر الدین البانی) ئەفەرموێت هەمو گیانی ئافرەت عەورەتە تەنها هەردوو لەپی دەست و دەموو چاوی نەبێت دیارە ئەوەش ئەبێت خۆی جوان نەكردبێت وە یان بەساڵدا چوبێت و بیری مێرد كردنەوەی نەێت پیاو تەماحی تێنەكردبێت هەروەها (محمد الدین الأبانی ) لە كتێبەكەی خۆیدا بەناوی (حجاب المرأة المسلمة في الكتاب و السنة ) لە لا پەڕە (٣٩) دا فەرموویەتی پێویستە لە سەر ئافرەتانی ئیماندار كە چونە دەرەوە، سەرپۆش و لەچكەكانیان بەسەریاندا بدەن و لە سەروی

ئەویشەوە عەبا لەبەر بکەن لەماڵەوە و لەگشت کاتەکانی تریشدا لەچکەکانیان بەسەریاندا بدەن و لەسەروی ئەویشەوە عەبا لەبەر بکەن، هەروە ها لە لاپەڕە (٤١) دا ئەفەرموێ سەلمێنراوە کە دەم و چاو (الوجه) عەورەت نیە ئەمەش ڕای زۆربەی زۆری زاناکانە، هەروەك و إبن رشد لە( البدایە /٨٩) فەرموویەتی هەروەك و مەزهەبی أبو حنیفە و مالك و شافعی و لە احمدەوە گێڕدراوە تەوە، هەروەها ئیمامی طحاویش لە(شرح المعانی) دا ئەمەی گێڕاوەتەوە . بەلام ئەوە لە کاتێکدا دەبێت کە دەست و دەم و چاوی نە ڕازاندبێتەوە وە لێوەکانی سوراو سپیاوی نەکردبێت و دەس و نینۆکەکانی سور نەکردبێت. دیارە ئەگەر وابێت واتە: دەست و دەم و چاوی ڕازابێتەوەو شەلالی ماکیاج بێت ئەو کاتە دەست و دەم و چاو یش دەبێتە عەورەت و دەبێت جوان داپۆشرێت و لە لای پیاوانی بێگانەونامەحرەم نابێت بە هیچ شێوەیەك دەریان بخات. خوێنەرانی بەڕێز ئاماژە بەو ڕێگایانە ئەکەم کە لە قورئان و سونەت دا هاتوون مۆڵەت ئەدەن بەدەر خستنی دەم و چاوی ئافرەت:

**یەکەم:**

أ- خوای گەورە لە قورئانا ئەفەرموێ (ولا یُبدِین زینتهُنَّ الاّ ما ظهر منها) نابێت ئافرەتی ئیماندار جوانیو ڕازاوەی خۆیان دەرخەن بۆ پیاوانی نامەحرەم بێجگە لەدەست و دەموو چاویان إبن عباس "ڕەزای خوای لەسەر بێت" لە تەفسیری ئەم ئایەتەیا ئەفەرموێت:

دەمو چاو هەردوو لەپی دەستو ئەنگوستیلەیە. اعمش لە سعیدی کوڕی جبیرەوە (ڕەحمەتی خوایان لە سەر بێت) ئەفەرموێت تەفسیری صحابە بەڵگەیەو کاری پێئەکرێت)

ب- خوای گەورە لە ئایەتی (٣١)سورەتی نوردا دەفەرموێت (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ)ئەی پێغەمبەری خوا بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ سەرپۆش و لە چکەکانیان بکەن و بەسەر سنگو بەرۆکیانا بەری دەنە خوارەوە. بێ گومان خوا قسەی لەڕو لە جێیە گەر بیویستایە فەرمان بکا بە داپۆشینی دەمو چاو ئەوە بە ڕاشکاوی ئەی فەرموو با دەمو چاویشیان داپۆشن نەك بە تەئویلێکی دوور باسی بکاتو نەیگێڕێتەوە ڕووی لێوەر گێڕاو فەرمووی ( يا أسماء إنَّ المرأة إذابَلَغَت سن المعيض لم يصلح ان يرى منها إلاَّ هذا و هذا ) ئەسمە هەر ئافرەتێك گەیشتە کاتی بێوێژی دروست نیە لێرەو لێرەی زیاتری بەدەر کەوێت ئیشارەتی بۆ دەمو چاوی خۆی و لەپەکانی دەستی کرد.

**دووەم:**

ابوداود لەسەنەدەکەی خۆیدا هێناویەتی لەحەزرەتی عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە(ڕەزاخوای لەسەربێت)ئەیگێڕێتەوەوئەفەرموێ:ڕۆژێکیان ئەسمائی کچی حەزرەتی ئەبوبکر هاتە لای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) و جلێکی تەنکی لەبەردابوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویی: (يا أسماء إذا بلغت سن المحيض لم يصلح أن يرى منها إلا هذا و هذا). ئەی ئەسما هەر ئافرەتێك گەیشتە تەمەنی بێنوێژی دروست نییە لێرە و لەوێی زیاتر بەدەر بکەوێت، واتە ئاماژەی کرد بۆ دەم و چاو و هەردوو لەپی دەستی.

**سێیەم:**

جابری کوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لەسەربێت) ئەیگێڕێتەوە عن جابر بن عبدالله قال : شهرتُ مَعَ رسول اللهِ (صلى الله عله وسلّم) الصَّلاةَ يوم العيدِ، فبدأ بالصَّلاةِ قَبلَ الخطبةِ بغَيرِ أذانٍ ولا إقامةٍ ثمَ قامَ متُو كئاً على بلالٍ فأتوَ بتقدى الله و حثَّ على طاعتهِ وَوَعَظَ النّاسَ وَذَكرَهم ثمَّ مظى حتّى أتى النّساءَ فَوَ عَظَهَنَّ وَذَكَرَ هُنَّ فقال تَصَدَّقنَ فأنَّ أكثر كُنَّ حَطَبُ جَهنمَ فَقامَتْ امْداَةٌ من سطةِ النّساء سَفْعَاءَ الخَدَّيْنِ فقالَتْ لِمَ يا رَسُول اللهِ قال لأ نَكُنَّ تُكْثِرنَ الشَّكاةَ وَ تَكْفُرْنَ العشير)[٢٥] ئەفەرمویٚ لە ڕۆژی جەژندا لە خزمەتی پێغەمبەرا نوێژم کرد، سەرەتا بەر لە وتاری نوێژی جەژن بێ بانگ و بێ قامەت هەڵسا نوێژی کرد پاشان موسڵمانانی هاندا بۆ جێبە جێکردنی فەرمانەکانی، ئامۆژگاری خەڵکی کردو بیری خستنەوە، دوایی ڕۆی بۆلای ئافرەتان ئامۆژگاری ئەوانیشی کردو بیری خستنەوە، پاشان فەرمووی خێروو چاکە بکەن چونکە زۆربەی ئافرەتان ئەهلی دۆزەخن، لەو کاتەیا ئافرەتێکی ڕومەت ڕەش هەڵگەڕاو لە ناوەڕاستی ئافرەتانەوە هەڵساو قسەی کرد و ووتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی زۆربەی زۆری ئەهلی دۆزەخ ئافرەتانن؟!، فەرمووی لەبەر ئەوەی زۆر گلەی و پرتەو بۆڵە ئەکەن و بەرامبەر بە هاوسەرەکانیشتان سپڵەن..... ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە

---

[٢٥] رواه المسلم والنسائي والدارمي وابن خزيمة والبيهقي واحمد.

جابر وەسفی ڕوومەتی ئافرەتەکەی کردووە، دیارە دەم و چاوی دیاربووە ئەگینا نەیدەزانی ڕەنگی ڕەش هەڵ گەڕاوە.

**چوارەم:**

سەهلی کوڕی سەعد "ڕەزای خوای لە سەر بێت" بۆمان ئەگێڕێتەوە (عن سَهْل بن سَعدٍ أنّ امْـرأةً جـاءت الى رسـول الله(صـلى الله عليـه وسـلم) و هُـوَ في المسجدِ، فقالَتْ : يار سولَ اللهِ جِئتُ لأ هبَ لله نَفْسِي .......فَصَمَتَ فَلَقَدْ رأيتها قائِمةً مَلِيّاً أو قال هَو يْنا، فَنَظَر إليها رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) فَصَعَّدَ النَّظَرَ إليها وَصَوَّبَهُ ، ثمّ طاطا رأسَهُ، فلمّارأتْ المرأةُ أنّهُ لَمْ يَقْصُدْ فيها شيئاً جَلَسَتْ.......)[٣٦] ئەفەرموێ ڕۆژێک ئافرەتێک هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا کە لە مزگەوت دابوو ووتی ئەی پێغەمبەری خوا من هاتووم خۆمت پێشکەش کەم، پێغەمبەریش بێدەنگ بوو، ئەڵێت من ئافرەتەکەم بینی زۆر ڕاوەستا و پاشان پێغەمبەریش تەماشای کردو بە جوانی چاوی پێدا گێڕا، دوای سەری خۆی نەوی کرد، ئافرەتەکەش کەزانی پێغەمبەر هیچی دەرنەبڕی دانیشت خۆشەویستان ئەم فەرموودەیە زۆر بەڕوونی ئەو ڕاستیە دەر ئەخات کە ئەفەرموێ دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیە ، ئەگینا پێغەمبەر تەماشای چیکردووە و چۆن بەوردی سەرنجی داوەتی؟!

**پێنجەم:**

حەزرەتی عایشە دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لەسەربێت) بۆمان ئە گێڕێتەوە (عن عائشَةَ رضى الله عنها قالتْ : كُنَّ نساءُ المؤْنساتِ كيشهَدْنَ مَعَ النبى (صلى الله عليه وسلم) صلات الفجر مُتلفِّعاتٍ و بمُروطِهِنّ، ثُمّ يَنقلِبْنَ إلى بيوتهِنَّ حينَ يَقضينَ الصّلاةَ لا يُعْرَفْنَ من

---

[٣٦] رواه البخارى والمسلم والنسائى واحمد والبيهقى والحميدى والزويلتى وابو يعلى وغيرهم

الغَلَس)[٢٧] وفي رواية ( وما يَعرفُ بعْضُنا وجوهُ بعض) ئەفەرمووێ ئافرەتـانی ئیماندارلەگـەڵ پێغەمبـەرا نوێـژی بـەیانیان ئـەکرد، عـەباکانیان لەخۆیانـەوە ئـە پێـچاو، کەنوێـژیان تـەواو ئـەکرد ئەگەڕانـەوە بـۆ ماڵـەوە بـەڵام لەبـەر تـاریکی و لێڵـی نەدەناسرانەوە، ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لە سەر ئەوەی کە دەموو چاوی ئافرەت عەورەت نیە[٢٨] چونکە بەهۆی تاریك و لێڵی بەیانیـەوە نـە ناسراون دەمـو چـاویان، جـۆ ئەگـەر تاریـك نەبوایـە ئەناسـران، بێگومـان کاتێکیش ئافرەت ئەناسرێت کە دەمو چاوی دیاربێت.

**شەشەم:**

عبدالله کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لە سەربێت) بۆمان ئە گێڕێتەوە ئەفـەرموێ: لـەڕۆژی جـەژنی قوربانـا و لـەکاتی سـەر بڕینـدا پێغەمبـەری خـوا ( صلى الله عليه وسلم) (فـضلی کـوڕی عباسـی) لەپشتی خۆیـەوە سواری وولاخەکەی کردبوو، فەزلیش جوان و بەرچاوبووە، پێغەمبەر لە گەڵ هەندێك خەڵکا وەستابوو فەتوای بۆ ئەدان و لەو کاتەیا ئافرەتێکی بەرچاو هات داوای فەتوای لە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) کرد، فەزلیش دەستی کرد بە سەرنج دان و سەیر کردنی ئافرەتەکەو جوانیەکەی سەر سامی کردبوو، پێغەمبـەر کـە ئـاوڕی دایـەوە زانـی ( فـەزل) تەماشـای

---

[٢٧] متفق عليه

[٢٨] ئەم فەرموودەیە البخاری والمسلم ابوداود و نسائی ابن ماجه ومالك واحمد والبیحقی وابن حزم )لە عبدالله کوڕی عباسەوە گێڕاویانەتەوە .

ئافرەتەکـە ئـەکات، بەدەسـتی پـیرۆزی خـۆی چـەناگەی گـرت و بردی بۆولاوە ئەم فەرموو دەیەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لـە سـەر ئەوەی کە دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیە.

**حەوتەم:** (عەتای کوڕی ئەبی رباح) ئەفـەرموێ ڕۆژێکیـان عبـدالله کوڕی عبـاس (ڕەزای خـوای لەسـەربێت)بـانگی کـردم و فـەرمووی (الا أُريكَ إمـرأَةً مِن أَهل الجنـةِ؟!) وەرە بائـافرەتێکی بەهەشـتیت نیشان بدەم؟! منیش ووتم ئادەی بفەرموو، فەرمووی (هذه المرأَةُ السَوْداءُ أَتَتِ النبيَّ – صلى الله عليه وسلم – فقالتْ :إني أُصـرَعِ و إنيَّ أَتَكَشَّفُ فادعُ الله لي ) فەرمووی: ئـەم ئافرەتـە ڕەشـە کـاتی خۆی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) ووتـی ئـەی پێغەمبـەری خـوا من فێم لێدیۆ و لـەو کاتـەیا کەفێیەکـەم لێدێت، ئاگـام لـەخۆم نـامێنێ و جل و بـەرگ بەبـەر خۆمـەوە نـاهێڵم، جـا هاتومەتـــە خزمـــەتت بـــۆ ئـــەوەی لـــەخوا بپاڕێیتـــەوە کەچـــاکم بکاتەوەو لەم نە خۆشیە ڕزگارم بێ. پێغەمبـەری خـواش ( صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (إن شئتِ صبرتِ ولك الجنةُ و إن شِئتِ دَعوتُ الله أَن يُعـا فَيـكَ) فـەرمووی ئەگـەر حەزدەکەیت ئارام بگـرە لەسـەر ئـەو فێ لێهاتنـەت و خـوای گـەورە بەبەهەشـت پاداشـت ئەداتـەوە و لەقیامەتیشدا ئە چیتە بەهەشتەوە، ئەگەر حـەزیش ئەکـەی لـەخوای گـەورە ئەپاڕێمـەوە بـۆت کـە چـاکت بکاتـەوەو شـیفات بـۆ بنێـریۆ جـارێکی تـر توشـی فێ ایهـاتن نـەبیت، ئافرەتەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هـەر

هەشتەم: بەڵگەیەکی تریشمان لەسەر ئەوەی دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیە ئەوەیە کە ژن خواز (خاطِب) بۆی هەیە سەیری دەم و چاو و دەستی ئافرەت کات کەواتە غەیری ژنخواز بۆی نیە سەیری دەم و چاوی ئافرەت کات، ئەمەش ئەوە ئەگەئەنێ کە دەم و چاوی ئافرەت عەورەت نیە.

## پۆشاکی کچە بچوکەکان:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگیەك و بایەخێکی زۆری داوە بە پەروەردەو فێرکردنی منداڵ بەمەبەستی چەسپاندنی بیرو باوەڕ لە دڵ و دەرونیان دا، ئەویش بەڕاهێنانی منداڵ لەسەر فێربوونی ئەدەبی خەوتن، پۆشاکی شەرعی، نان خواردن،لەسەربەخۆیی، خاوێنی بیرو باوەڕ، پاراستنی زمان، ڕێزی گەورە، سلاوکردن، بەلاَم بەشێوەیەکی لەسەرخۆ و وردە وردە، بەپێ ی تەمەن و کاتەکان، هەروەها سونەتی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم) فێرکردنی منداڵ لەکاروباری ئاینیەکەی هەر لەدەست نوێژ و پاك و خاوێنی و نوێژو ڕۆژوو پاڕانەوەو خورەوشتی جوان، پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیە وسلم) بەڕونی جەخت لە سەر پەروەردە کردنی منداڵ دەکاتەوە بەپێی قۆناغەکانی ژیانی و ئەفەرموێ: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع واضربو هم عليها و هم أبناء عَشر فرقوا بينهم في المضاجع))[30] واتە: فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان بەوەی کەهەستن بە فێربوون و ئەنجامدانی پێنج فەرزەی نوێژ، کاتێك کە تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵی ئەگەر باش بەدەم فەرمانەکەوە نەهاتن و، سست بوون لەجێ بە جێ کردنی نوێژەکان، بە قسەی خۆش و نەرم و

[30] صحيح اخرجه ابوداود (٤٩٤ )وابن خزيمه( ١٠٢١٢ )والحاكم (٢٠١١١) وغيرهم)

نیانی لەگەڵیاندا هەوڵ بدەن هەتا نوێژەکان لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەن، ئەگەر تەمەنیان گەیشتە دە ساڵی و هەروا مانەوە شێوازێکی تر بەکار بێنن ئەویش لێدان بەلام لێدانێك کە زەرەر نەداتە لاشەی و کاریگەری خراپی نە بێت لە سەر جەستەی، وە لە کاتی لێدانەکەشا سەرو دەموو چاوی بپارێزێت، هەروەها ئەفەرموێت: شوێنی نوستنی کوڕکچ جیا بکەنەوە، با کوڕان لەژورێکدا بخەون و کچانیش لەژوورێکی ترا بخەون، هەروەها هاندانی کچ بۆ خۆداپۆشین و شەرمو حەیا هەرلە منداڵی یەوە بۆ ئەوەی کە گەورە بوو لەسەری ڕابێت، کەواتە: نابێت کیژۆڵەکانمان جلی کورت و پانتۆڵ و سترێچ و هاوشێوەکانیان لە بەرکەن چونکە ئەوە خۆشوپهاندنە بەپیاوان و خەڵکانی بێ باوەڕ، هەروەها ڕابهێنرێت لە سەر داپۆشینی سەر ئەگەر بە پارچە قوماشێکی تەنکیش بێت بالە تەمەنی حەوت ساڵیش دا بێت، هەروەها پێویستە دایکان و باوکان ئامۆژگاری منداڵکانیان بکەن هەر ڕەگەزەیان پەیوەست بێت بە جلی تایبەتی خۆیەوە بۆ ئەوەی جلی نێرینە جیاوازبێت لە جلی مێینەو دوریش بن لە جلی بێگانە. ئەرکی دایك و باوك و مافی منداڵ لە سونەتی صحیحی پێغەمبەری خوادا ( صلی الله علیه وسلم) دیاری کراوە، کەواتە پێویستە لە سەر بەخێوکەری منداڵان، چ دایك و باوك و برا و هەرکەسێکی تر بێت کە مناڵەکانیان لە سەر بەرنامەی خوای پەروەردگار و ڕەوشت و کلتوری ئیسلامی ڕابهێنێت، بەتایبەتی حیجاب و پۆشاکی شەرعی و دەبێ لە کاتی پەروەردەکردنی منداڵەکانی دا ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکات:

**یەکەم:** منداڵەکان چ کوڕبن و چ کچ بن دەبێت لەتەمەنی چوار ساڵی یەوە لەسەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەی خوا ( صلی الله علیه وسلم) ڕابهێنرێن. هەروەها دەبێت لە سەر خۆشە ویستی دایك و

باوك و گوێڕایەڵی ڕابهێنرێت، چونكە لە هەر شوێنێك خوای گەورە باسی مافی خۆی كردبێت ڕاستەو خۆ دوایش باسی مافی دایك و باوكیشی لە گەڵا كردووە، بەواتای ڕەزامەندی خوا بەدەست نایات هەتا دایك و باوكیشی لێی ڕازی نەبێ، پێویستیشە بە خێو كەری منداڵان هەندێ فەرموودەی خواو پێغەمبەرو چیرۆكی بەسودیان بۆ بگێڕێتەوە تاكاریگەری باشیان لەسەر دروست بكەن.
دووەم: هەروەها پێویستە بە خێوكەری منداڵان ئامۆژگاری منداڵان بكەن كە لەناو ماڵ دا و لە پێش چاوی بێگانەو نا مەحرەم هەموو لەشی خۆیان دا پۆشن و بێجگە لە دەموچاو وە هەردوو دەستەكانیان نەبێت. وە ئامۆژگاریش بكرێن كە سەرو قوڵ و سنگیان داپۆشن، هەروەها كیژۆڵكان لە تەمەنی پێنج ساڵیەوە ڕابهێنرێت لە سەر داپۆشینی سەرو قژیان، بەو شێوازەی كە دینی ئیسلام ئەیەوێت و پێشینەی چاكە كانی ئێمە ڕۆڵكانیان لە سەر پەروەردە كردووە، و پێویستە دایكان و باوكانی بەڕێز لەچك و سەر پۆشیان بۆ بكڕن و ئامۆژگاریان بكەن كە قژو سەرو پرچیان داپۆشن، تاوەك و دەست بەرداری پۆشاكی شەرعی نەبن، بۆیە زانایانی فەقیهزانی إمامی شافعی (ڕەحمەتی خوای لەسەربێت) فەرموویانە هەركاتێك كچ حەزو ئارەزووی جولا دەبێت پۆشاكی شەرعی لە بەربكات، پلەی جولاندنی حەزوو ئارەزووی كچانیش بە پێی ئاو هەوای ئەو ژینگەیەی تێدا دەژین دە گۆڕێت، جا لەهەر ژینگەو ئاو هەوایەكا بێت گەیشتە جولاندنی حەزو ئارەزووەكانی دەبێت پۆشاكی ئیسلامی لەبەر بكات، یان بەواتایەكی تر گەیشتە ساڵی

بێنوێژی (الحیض) ئەو کاتە پێویستە دایکانو باوکانو بە خێوکەری منـدالآن فێریـان بکـەن لەسـەر پۆشـینی پۆشـاکی شـەرعی ئەگـەر دایکانو باوکان و بە خێو کەری مندالآن ئەو هەوڵە یان لەگەلآ نـەدان گوناح بارن.

سێ یەم: باشترین ڕێگا بۆ ڕاهێنـانو پـەروەردە کردنـی کچان لـە سـەر پۆشینی پۆشاکی ئیسلام ئەوەیـە کـە دایكو خوشکە گـەورەکانیان خۆیـان دەسـت پـێش خـەری بکـەن بـۆ ئـەوەی ئـەوانیش چـاویان لێبکەن، سەد ڕەحمەت لە قەبری کوردەوای بێت کە فەرمویان ( گیا لـە سەر بنجی خۆی ئەڕوێتـەوە)، یـان گـەورە ئـاو ئەڕێـژێ بـچوکیش پێی لێـە خشێنێ، دایك چۆن بێ کچەکەش وایە کەواتە ئەبێت کچان لە تەمەنی حەوت ساڵی یەوە لە سەر ئەمانەی خوارەوە ڕابهێنرێت.

١- لەبـەر کردنـی ئایـەتو فـەرمودەکانی پێغەمبـەر ( صـلی الله علیـە وسلم) کەلەبارەی پۆشاکی شەرعیەوە دە دوێن.

٢- شـیکردنەوەو ڕون کردنـەوەی سـودو قازانجـەکانی پۆشـاکی شەرعی لە هـەموو ڕوەکـانی سیاسـیو ئـابووریو کۆمەلآیەتیەتی و تەندروستی و ئابوریەوە.

٣- ئـەبێت کـچان لـە زیانـەکانی ڕوتو قـوتیو خـۆ ڕوتکردنـەوەو تێکـەڵی پیـاوان وشـیار بکرێنـەوە، چـونکە سەرپێـچی کردنـی فەرمانەکانی خـوا و پێغەمبـەر ڕەق هەسـتانی خوایـەو سـەرەنجامیش چوونە ناو ئاگری دۆزەخە، پێویستە ئـەو ئایـەتو فەرمودانـەیان بۆ بخوێنرێتـەوە کـە هـەرکاتێك کـە حیجابەکـەی فرێدا خـواو پێغەمبـەر لێی ئەڕەنجێن.

٤- پێویستە زیان و مەترسیەکانی مادەکانی خۆ جوان کردن و ئارایشت کردنیان لەڕوی شەرعی و تەندروستی یەوە بۆ ڕونبکرێتەوە.

٥- هەروەها پێویستە لەمنداڵیەوە لەمەترسی تێکەڵ بوونی ناشەرعیانەو لە گەڵ کوڕان و پیاوانی بێگانەی نامەحرەم وریا بکرێنەوە و، هەموو زیانەکانی ئەو تێکەڵ بوونەیان بۆ ڕون بکرێتەوە، وە تێبگەیەنرێت کە مانەوەی و تێکەڵی نێرومێ بە تەنها ( الخلوة) حەرامەو چەندین فیتنەو بەلاّ ڕویان داوە کەواتە سەرەنجام پێویستە هەممومان بەدایکان و باوکان و گەورەو بچوکەوە ئەو ڕاستیە بزانین کەدینی ئسلام ئاینی خێرو بەرەکەت و چاکە گوزاری یە بۆ هەموو مرۆڤایەتی سەر ڕوی زەوی، وە پێشینەی ئێمە بەگەورەو بچوکەوە پۆشاکی ئیسلامیان پۆشیوەو کیژۆڵکانیشیان هەر لە منداڵیەوە لەسەر لە بەر کردنی جل و بەرگی حەیاو شەرعی ڕاهێناوە و، کەچی بە داخەوە ئێستە خوشکان و دایکان نەك هەر کیژۆڵە ساوا کانیان بەڵکو بۆ خۆشیان پۆشاکی حەیا و حورمەتی شەرعیان فڕێداوەو پۆشاکی ناموسلمانانەیان لە بەرکردووە و لاسای کافرەکان ئەکەنەوە، بۆ یە پێغەمبەری خوا (صلی الله علە وسلم) فەرموویەتی (( لتتبعنَّ سنن من کان من قبلکم شبراً بشبر ذراعاً بذراع، حتی لء دخَلُوا جحر ضب لتبعتموهم: قالوا: الیهود والنصاری؟ قال فمن؟) هەروەها لە فەرموودەیەکی ترا فەرموویەتی (عن أبی هریرة (رضی الله عنه) عن النبی (صلی الله علە وسلم) قال: ( لاتقوم ساعة حتی تأخذ أُمَّتی بأخذِ القرُن قبلها، شبراً بسبر و ذراعاً بذراع)، فقیل:

یارسو الله، کفار من و الروم ؟ فقال: ( و من الناس إلاّ أو لئك)[31].واتە: ڕۆژی دوای نایەت هەتاوەك و موسڵمانان بست بە بست و پێبەپێ دوای داب‌ونەریتو خوی گەلانی پێش خۆتان دەکەون ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیە وسلم) مەبەستت لە فارس و ڕۆمەکانە، فەرمووی بەڵێ ئەی لەوان بەو لاوە کەسی تر هەیە؟ وتیان ئەی خۆشەویستی خوا مەبەستت جولەکەو گاورەکانە فەرمووی بەڵێ. بۆ یە خۆشەویستان ئێستە ئەبینین بێ باوەڕان و دوژمنانی دینی خوا ئەیانەوێت مندالآن لە منداڵیەوە فێری داب‌و نەریتە بۆ گەنەکان کەن و هەوڵ ئەدەن ڕەوشت‌و ڕەفتاری خۆیان لە ناو دڵ‌و دەرونیانا بڕوێنن، ئەیانەوێت جل‌و بەرگی نا شەرعی لەبەری منداڵە بچوکەکانیان بکەن کەنامۆو ناشایستەیە بە دینەکەمان‌و هەم بەمیلەت‌و نەتەوە کەمان. جل‌و بەرگێك کە ئەصلەن داپۆشەر نیە هەموو ڕان‌و لەشیان بەدەرەوەیە، وە هەر لە منداڵیەوە فێری مادەی خۆجوان کردن‌و ماکیاجی بێ شەرعیانەیان دەکەن و دەم و ڕوومەت و پێڵوی چاو لێویانی پێسەوزو سور شین ئەکەن، وەلاّهی لە ئێستاوە ئەو منداڵە پێست ناسکانە گوناحە دەمو چاویان دەرمان‌و مادەی کیمیاوی یەکانی لێ بدەن!! ئێستە هەر لە قۆناغی منداڵ بوونەوە کە هەفتەی یەکەمی دەڕوات بەسەر لە دایك بونیا لە بری (الله اکبر) و بانگ‌و قامەت دان بە گوێی ڕاست‌و چەپیدا بدەن، ئە چن گۆرانی‌و مۆسیقایان بە گوێیا ئەدەن، لە هەموو ئەوانەش خراپتر

---

[31] مختصر صحیح البخاری ل-٧٣٢

کاریگەر تر ئەوەیە کە بە دایكو باوکی ئەو مندالآنە ئە لێ ی لە مندالّیەوە مندالّە کانت ڕابێنە لە سەر پۆشاکی شەرعیو بەرگی شەرموو حەیا لە وەلآما ئەلّێن: جاریّ ئەوان مندالّنو چی تێدایە وابن، یان ئەلّیّ کە گەورەبوون خۆیان چاك ئەبن ئێمەش کاتی خۆی ئەو جلانەمان لەبەر کردووە و هیچ زیانێکی نیەو دوایش لەسەر جلو بەرگی تر ڕاهاتین، ئەوانیش دوای کە گەورەبوون خۆیان فێرئەبن. نە خێر خوشکی بەڕێزم دایکی خۆشەویستم بە شێوەیەکی شەرعیانە پەروەردەی مندالّەکەت بکە چونکە لەسەر هەر شتێك ڕاهات کە گەورە بوو وازی پیّ لێناهێنرێت. کورد وتەنی: ( دار بە نەمامی ڕاست نە کرایەوە بەگەورەیش ڕاست نابێتەوە). بۆ یە ئامۆژگاری بۆ هەموو موسلّمانێك بەتایبەتی خوشکانو دایکانی بەڕێز کە هەر لە سەرەتاوە کچە کانیان فێری پۆشاکی شەرعی و ڕەوشتەبەرزەکانی ئیسلام بکەن، چونکە کە گەورەبوون لە دەست دەر ئە چن و خەلّکانی خراپو بیّ باوەڕ جلّەوی مندالّەکەت لە دەست دەر دێنن، بۆیە لەسەرت پێویستە کوڕەکانیش و کچەکانیشت لە سەر پۆشاکی ئیسلامیو ڕەوشتی بەرزی ئیسلام پەروەردە بکەی، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژا هیچ هۆکارێکی دەرەکی کاریان تێنەکاتو کەسایەتیەکی بەهێزو پتەویان هەبێتو هیچ ڕەشەبایەك نەیان هەژێنێت.

# بەشی سێیەم

## لقی یەکەم: خۆ جوان کردن و خۆڕازاندنەوە (التبرج):-

### أ- لە ڕووی شەرعیەوە:

(الماوردی) بەم جۆرەی خوارەوە پێناسەی خۆجوان کردن و خۆڕازاندنەوەمان بۆ ئەکات و ئەڵێت: بریتیە لەو مادە جوانیانەی کە ئافرەت لە خۆ جوان کردن و خۆ ڕازاندنەوە دا بە کاریان دێنێت وەك:

١- جل و بەرگ و پۆشاك کە لەبەریان دەکات.

٢- چەند مادەیەکی تری خۆ جوان کردنی لە شی خۆی بەکاری دێنێت وەك خشڵ و خڕ خاڵ و خەنەو و سمەو ( سوراو سپیاو بۆیەی لێو چاو نینۆك............).

٣- هەروەها بە مەبەستی خۆ جوانکردن برۆباریك کردن و بۆن خۆشی و دەم و چاو هەڵگرتنیش ئەکات. بەیارمەتی خوا ئەم سێ خاڵەی سەرەوە بە درێژی ڕوون ئەکەنەوە.

### ١- جل و بەرگ و پۆشاك:

جل و بەرگ لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی مرۆڤ دا بۆ مەبەستی خۆداپۆشین و پاراستنی لەشی بووە لە هەموو مەترسیەکی دەرەکی کە توشی لەشی مرۆڤ دەبێت لە هەر بەرکەوتنێك و

هێرشەکانی سەرماو سۆڵەو کەش‌و هەوا، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات‌و هەنگاونانی ڕەوڕەوەی مێژوی ژیانی مرۆڤ و بەرەوەپێش چونی شارستانیەتی مرۆڤ و ژیانی کۆمەڵایەتی مەبەستێکی تریشی بە خۆیەوە گرت. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە هەرگیز چاوی تێرنابێت ئەویش ئەوەبوو کەوێڕای خۆ داپۆشین‌و خۆپاراستن ، بۆ خۆ ڕازاندنەوەو خۆ جوان کردن بەکاری هێناوە ، مرۆڤ بە کاریشی دێنێ تا دونیا دونیایە. جا با بزانین هەڵوێستی ئیسلام لەو خۆ جوانکردن‌و خۆڕازاندنەوەیەدا چیە؟
ئافرەتان سروشتی خۆ ڕسکی خۆیان وایە کە زۆر حەزیان لە خۆ جوانکردن‌و خۆڕازاندنەوەیە، جابەهەرشێوەیەك بەدەستی بێنن، دیارە خۆ جوانکرن‌و خۆڕازاندنەوە مافی خۆیانەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی ئەم هەڵوێستە ناوەستێتەوە لە بەردەمیشیانا ئاستەنگ دروست ناکات. بەمەرجێ ئەو خۆ جوان کردن‌و خۆڕازاندنەوەیە لە چوار چێوەی شەریعەتی ئیسلام دەرنەچێت . ئەوەتە ئیسلام دێت ئەم خۆ جوان کردن‌و خۆڕازاندنەوەیە ڕێك دەخات‌و سنورو چوار چێوی بۆ دا ئەنێت نەوەك‌و لە ئەنجامدا زیادە ڕۆی تیا بکرێت‌و ببێتە هۆی بڵاوبونەوەی فەسادو خراپە کاری لە ناو کۆمەڵگای موسڵماندا ، بەڵێ ئیسلام ڕێگەی بە ئافرەت داوە کە چۆنی دەوێ ئاوا خۆی برا زێنێتەوە چ لە پۆشاك‌و چ لەجل‌و بەرگ دا چ لەبۆنی خۆش‌و ئارایشت کردن‌و خۆ بۆن کردن‌و خۆڕازاندنەوە چ لە خشڵ و خاڵدا، بەڵام بە مەرجێك لەسنوری شەریعەتی ئیسلام تێنە پەڕێت لە گەڵ ئەو خاڵانەی کە لەڕابردودا باسمان کرد، واتە ئەم خۆ جوان

کـردنو خـۆ ڕازاندنەوەشـی تـەنها بـۆ مێـردی خـۆی بێـتو نابێـت بـۆ پیاوانی بێگانە بێت. خـوای گـەورەش لـە پۆشـاك دا دوو ئامـانجی بـۆ مرۆڤـ داناوە بۆ خۆداپۆشینو بۆ خۆڕازاندنـەوە هـەروەك لـەم ئایەتـە پیرۆزەیا دەر ئەکـەوێت.(( یَا بَنِـي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَـا عَلَيْكُمْ لِبَاسـاً يُوَارِي سـوْآتِكُمْ ورِيـشاً وَلِبَـاسُ التَّقْوَى ذَلِـكَ خَيْـرٌ ذَلِـك مِنْ آيَـاتِ اللّـه لَعَلَّهُـمْ يَذَّكَّرُونَ))[32] واتە مرۆڤەکان جلو بەرگمان بۆ ئێوە هێناوەتە کایەوە بۆ ئەوەی عەورەتو لەشی خۆتانی پێ داپۆشن خۆتانی پێ بڕازێنەوە

## ٢- مادەکانی خۆ جوانکردنی لەش وەك و خشڵ و خرخاڵ:

بەڵێ ئـافرەت بـۆی هەیـە خـۆی بـە زێـڕو زیـو گـەوهـەرو مـەرجانو خەنـەو هـەموو مـادەو شـتە کـانی تـری ئارایـشت بڕازێنێتـەوەو خـۆی پـێ جـوان بکـات بەڵام لـە چـوار چێوەی قورئـانو سـونەتی پێغەمبەردا ( صلى الله عليه وسلم)

وێڕای ئەمانەی باسمان کـرد ئـاینی پیرۆزی ئیسلام ڕێگـەی داوە بە ئـافرەت لـە خۆڕازاندنـەوە و لـەخۆ بـۆن خۆشـکرنەوە بـۆ ژنـانی مێرد کردوو بەڵام دەبێـت ئـەم خـۆ جوان کـردنو خۆڕازاندنەوەیـە تـەنها لەبـەر دەم مێردەکانیـان دا بێـتو بـەس نیـازی خـۆ جـوان کردنەکـەی تـەنها بـۆ ئـەو بێـت، چـونکە ئـاینی ئیسلام فـەرمان بـە ئافرەتـان دەکـا کـە ئەوەنـدەی بـۆی دەکرێـت دە بێـت خـۆی بـۆ

[32] سورە العراف ٢٨.

مێردەکــەی بڕازێنێتــەوە خــۆی بــۆ جــوان و ئارایــشت بکــاتو هەمیشە سەروو ڕوخۆش بێت لەگەڵیدا، لە کاتێك دا ئە گەر دڵ تــەنگو کێــشەشی هــەبێت دەبێــت هــەوڵ بــدات لەبــەردەم هاوسەرەکەی بیشارێتەوە خۆی وانیشان بدات کە ڕوو خۆشو دڵ خۆشەو هیچ کێشەیەکی نیە بۆ ئەوەی مێردەکەی دڵ خۆش بکات، جا دە فەرمویٚ ئەگەر ئێواران مێردەکەی لـە کارو کاسپی ڕۆژانـە هاتـەوە بالەبـەردەرگای مـاڵ بەپیریـەوە بـچێتو بەسـەرو ڕویـەکی گـەشو پـاراو و خۆشـەوە بـەخێر هاتنـەوەی بکـات. لەبەرامبەر ئەمـەش خـوای گەوورە پاداشـتێکی زۆری ئەداتـەوە، سەرە ڕای ئەوەش پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیان دا بە هێز تــر دەکــات و ژیــانێکی بەختەوەرانــەش بەســەر دەبــەن، ئــەو مندالأنـەش کـە لـەداوێنی پـاکیو شـەرعیانەیانەوە دەکەنـەوە لـە سـەر هــەمان ڕێبــاز پــەروەردە دەبــن و ســەرەنجام خێزانێکــی ســەرکەوتوو بەختــەوەر دواتــریش کۆمەڵگــە ســەرکەوتو و سەرفرازی بەگوێرەی بەرنامە قورئانو سونەتیانەی لێ دروست دەبێتو خوای گەورەش لێیان ڕازی دەبێت.

**٣: مادەکــانی خــۆ جــوان کــردن وەکــو ئارایــشتو ســوراو و ســپیاو:**
خۆشەویـستان ئـەوەی خـوای گـەورە لـەئافرەتانی موسـڵمانی قەدەغەکردووە ئەوەیە کە ئەم خۆ جوان کردنو خۆڕازاندنەوەیـە بۆ پیـاوی نامـەحرەم نـەبێت، بـەڵکو تـەنها بـۆ مێردەکـانی خۆیـان بێـتو بـەس. بـەلأم بەداخـەوە ئـەوەی ئـەمڕۆ ئـە بینـریٚ ئەوەیـە

کەژنان بۆ مێردەکانی خۆیان خۆیان ناڕازێنەوە، نەك هەر ئەو ئافرەتانەی کە شویان کردووە بەڵکو ئەو کچانەشە کە گەنج و هەرزەکارن و ئەو ئافرەتانەش کەپیرن و چونەتە تەمەنەوە بە جوانترین خۆڕازاندنەوەو ئارایشتەوە دەچنە بازاڕو کۆڕو کۆبوونەوەکان و ناو فەرمانگەو دەزگاکانەوە خۆیان نیشانی کوڕانی گەنج و لاوەکان ئەدەن. بە بۆنی خۆش و جل و بەرگێکی ئالاَّ و والاَّپۆش و سەرپۆش فڕێدان و قژڕووت کردن و نیگرۆو قژلول کردن و سوراو سپیاو کردن و کوڵم سورکردن و لێو نینۆك سورکردن و لەبەرکردنی پانتۆڵی تەسکی سمت دەر پەڕێن و تەنورەی کورتی سەر چۆکان و تەنورەی تەنگەبەرو مینی جۆب وسترێج و شانتۆڵ و چی و چی یەوە.......... هەموو ئەمانە ڕای دەکێشن بۆ دەرخستنی قاچ و بەلەك تا پشت ئەژنۆیان دەر ئەخەن کاتێك کە لەماڵ دەچنە دەرەوە بۆ بازاڕو دام و دەزگاکان و بۆ دەوام کردن و ناو کۆڕ و کۆبوونەوەکان کەچی کەهاتنە ماڵ هەرچی دەرمان و سوراو سپیاو و ئارایشت هەیە دەی سڕنەوە جلە جوان و ئالاَّو والاَّکانیان کە لەبەریان کردوون فڕێی دەدەن و هی تر دەکەنە بەریان بە شڕۆڵەیەوە خۆیان نیشانی مێردەکانیان دەدەن، کچانیش هەروان بۆ سەرنج ڕاکێشانی گەنجان و هەرزەکارەکان وادەکەن تابیان خوازن و داواکاریان هەبێت و هاوسەری ژیانیان دەست بکەوێت، گوایە ئەگەر وانەکەن

مێردیان دەست ناکەوێت بەڵام بێئاگان لەوەی کە خوای پەروەرد گار لە خۆیان دەرەنجێنن و کوڕانیش نایان خوازن.

مامۆستا ئەحمەد میرزا ڕۆستەمی لە کتێبی (پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆش بەختی تاك و کۆمەڵە)[٣٣] دەڵێت لەم ساڵانەی ڕابردودا هەرچەندە من بۆ خۆم نەم دیوە بەڵام برادەرەکانم بۆیان گێڕاومەوە و ووتیان: لە یەکێ لە تەلە فیزیۆنەکانی شاری سلێمانی  نازانم هیی کام لایەن بوو، ڕۆژێکیان مایکرۆفۆنی ئەو تەلە فیزۆنە دەچێتە ناو بازاڕو لەخەڵکی سادەی ناو بازاڕو شەقامەکان بەژن و پیاوەوە بە کوڕو کچەوە دەپرسێ سەبارەت بە ئارایشت و خۆ جوان کردنی ئافرەتان، لەوەڵام دا هەندێك خەڵك لایەنگیری ئەو ئارایشت و خۆ جوان کردنەیان کردووە، هەندێکی تریشیان بەتوندی دژی وەستاونەتەوە یەکێ لە پرسیارەکان کە لە پیاوێك دەکرێت و پێی دەڵێن ڕات چۆنە سەبارەت بەو ئارایشت و خۆجوان کردنەی ئافرەتان بۆدەرەوە دەیکەن، لە وەڵام دا دەڵێت. وەڵاهی من بەش بەحاڵی خۆم پێی ڕازینیم و بەکردەوەیەکی خراپ و ناشەرعی دەزانم پێشکەشکاری بەرنامەکە دەڵێت بۆ؟! کابراش دەڵێت: وەڵا من هەر بەژنەکەی خۆما ئەزانم خراپە، چونکە هەر کاتێك کە دە چێتە بازاڕ بۆ شت

---

[٣٣] مامۆستا احمد میرزا رۆستەمی(پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاك و کۆمەڵ) .ل ٧٨

کرین یان دە چێتە دەوام خۆی تاس و لوس دەدات و دەم و چاوی دە نەخشێنێ و خۆی بەتەواوی لە سوراو سپیاو شە لاڵ دەکات و،تەنورەی کورت و تا سەر ئەژنۆ لەبەر دەکات و دەڕواتە دەرەوە، کەچی کەهاتەوە ماڵێ خێرا خۆی ئە گۆڕێ و جلی شڕو شۆڕ لەبەر ئەکات و جوان جوان ئەو ئارایشت و سوراو سپیاوە ئەشواتەوە کەچی کە هاتە ماڵەوەش خۆی بۆمن وەك و پیرێژن لێ ئەکات، واتە دیارە ئەوەی پێشوی بۆ پیاوی بێگانەیەو بۆ منی نیە ئەوەی بۆ منە ئەوەیە کە هاتە ماڵەوە دەم و چاوی چرچ و لۆچ و قژ ئاڵۆسکاو بۆن عەرەق و سیرو پیازی لێ دێ ئاخر پێم ناڵێی دڵی چیم بەو ئارایشتە ساختەیە خۆش بێت کەبۆ دەرەوە ئەیکات هەروەها لەپێکردنی پێڵاوێك کەسەرنجی پیاوان ڕادە کێشێت کە ئەوەش نادروست و حەرامە،هەروەك و ئەو پێڵاوو قۆندەرە بن بەرزانەی کە تەقەتەق دارن بەڵام وەك و هۆکارێکی ڕاگەیاندن و ئاگادار کردنەوە لەدوورەوە هاوار دەکات و دەڵێت، گەنج و لاوەکان، ئەی کۆمەڵی پیاوان (یا معشر الرجال و الشباب) وریابنەوە واهاتم هەمووتان سەیرم کەن!! لە زەمانی جاهیلی دا ئافرەتان خرخاڵیان لە قاچ کردووە لە جیاتی ئەوەی لە دەسی کەن لە قاچیان کردووە بەڵام کاتێك کە ڕۆیشتون بەرێگادا قاچیان بە ئەرزەکەیاداوە تەقەی هاتووەو سەرەنجی پیاوانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاوە بۆیە خوای گەورە لەو دیاردە ناشرینە بە حەزرەتی جبرایلا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ

پێغەمبەر کە ئەفەرموێ : (وَلا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ) ئەی پێغەمبەری خوا پێیان بڵێ نابێ ئافرەتانی ئیماندار بە تەعبیری ئەم ئایەتە قورئانیە پێلاوی بن بەرز لە پێکەن و کاتێ کە ئەڕۆن تەقەی بێ و یەکسەر پیاو بزانێ کە ئەوە ئافرەتە و ئاوڕی بۆ بداتەوە، ئەبێ خوشکان زۆر وریابن نەشکێن، چونکە ئیسلام ڕێزی زۆری لە ئافرەت گرتووە پێغەمبەری خۆشەویست ( صلى الله عليه وسلم) ئەفەرموێت "إياكم القوارير) ئافرەتان وەك‌و شوشە ناسك‌و نازدارن ئەبێ زۆر وریای خۆیان بن نەشکێن، چونکە خوانەکردە کە شوشە شکا شوێنی خۆی ناگرێتەوە، جا خوشکی بەڕێزم زۆر وریابە نەشکێی‌و بە چاوی گورگانەوە سەیر نەکرێیت چونکە خەڵکانێك هەیە دڵیان نەخۆشە و حەزیان لە شکاندنی شوشەیەو چاویان بەڕوناکی و ڕۆشنای هەڵنایەت.

## ٤: مادەکانی خۆ جوان کردن وەك ( بڕۆباریك کردنەوەو گۆڕینی بڕۆو برژانگەکان نینۆکە کان ):

خۆشەویستان ئاینی ئیسلام هیچ بوارێك لەبوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی فەراموش نەکردووە بۆیە هەر حاڵەتەو بۆ هەربوارێکی ژیان ڕێوڕەسم‌و ڕێگا چارەی کێشەکانی ژیانی مرۆڤی بەنێرو مێیەوە ڕێك خستووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ هەرگیز نەکەوێتە گێژاوی لادان‌و سەر لێشێواویەوە، بێجگە لەوەش زۆر

ژیرانە و حەکیمانە ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتی ڕێك خستووە بۆ ئەوەی لە دونیاو لە قیامەت دا بە ژیانێکی خۆش بژیو دووربێ لە هەموو هەڵەو پەڵەیەك، لەم بەشەی باسەکەشماندا بە پشتیوانو کەرەمی خوای پەروەرد گار باسی خۆ جوان کردنو خۆڕازاندنەوە لەڕوانگەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامەوە دەخەینە بەر چاوی خوێنەران کە دینی پاكو بێگەردی خوا داوای لە مرۆڤان کردووە خۆیان جوانو ڕێكو پێكو بۆن خۆش بکەن، لەم بوارەشدا داوای لە ئافرەتان کردووە لە ڕوانگەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامەوە دەخەینە بەر چاوی خوێنەران کە دینی پاكو بێگەردی خوا داوای لە مرۆڤان کردووە خۆیان جوانو ڕێكو پێكو بۆن خۆش بکەن، لەم بوارەشدا داوای لە ئافرەتان کردووە کە بەسیفەتە سروشتیەکان (خصال الفگرە) خۆیان بڕازێننەوە، کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا زیاتر ڕونیان دەکەینەوە.

**یەکەم:** نینۆك کردنو ڕێك خستنیان بە پێچەوانەی ئەوەی ئێستە ئافرەتانی موسڵمان دەیکەن، کە نینۆکە کانیان ناکەن تا درێژ دەبێ کە من نازانم چۆن بەو نینۆکە درێژانەوە خۆیان پاك دەکەنەوە، لەکاتێك دا خوای پەروەرد گار داوای لەژنو پیاوی موسڵمان کردووە کە نینۆکە کانیان بکەن و پاکاو خاوێنی خۆیان ڕابگرن کەبەڕای زۆربەی زانایانی ئیسلامیش ئەم نینۆك کردنە سونەتە، چونکە یەکێکە لە سونەتە سروشتیەکانە، کە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم) هاتووە.

هەروەها نینۆك كردن بەلای زۆربەی زانایان سونەتە بەڵام ئیسلام كاتیان بۆ دانەناوە دەفەرموون هەروەختێ كاتی نینۆك كردن هات پێویستە بیكەیت، سەرەڕای ئەوەش چاك وایە ئەو نینۆك كردنە لەڕۆژی جمعە دا بێتو پێش نوێژدا بكرێ بە بەڵگەی حەدیسی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) كە ئەبوو هریرە صحابەی بەڕێزو خۆشەویستی پێغەمبەری خوا گێڕاویەتیەوە بۆ مانو دە فەرموێ ( كان نبی (صلي الله عليه وسلم) يقص شاربهُ و يَقلُمُ أ ظافيرهُ يوم الجمعة قبل أن يروحَ إلى الصلاة)) أخرجه البهيقي والبزاز و الطبراني في الأوسط) دە فەرموێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لە ڕۆژی جمعە دابەر سمێڵی دەكردو نینۆكیشی دەكرد پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژكردن، چاكیش وایە ئەو نینۆكەی وەك ڕێز گرتنێ لە ئەندامەكانی مرۆڤ و بخرێتە ژێر گڵەوە. بە ڕاستی خۆشەویستان ئەوانەی كە بەناوی پێش كەوتن و علمەوە نینۆكیان دەهێڵنەوە حاشا ئەوە پێچەوانەی عیلمو پێشكەوتنەو ئەبێتە هۆی كۆبوونەوەی پیسی و پۆخڵی لە ژێری دا، بە داخەوە هەندێ لە ئافرەتی موسڵمانیش توشی ئەم بەڵایە بووە بەناوی پێشكەوتنو ڕۆشنبیریەوە نینۆكیان دەهێڵنەوە ئەصلەن لەڕووی زانستیەوە دكتۆرە بەڕێزەكان بەشێكی ناتەندروستی دا دونێن و پیسی لەش دێتە دەرەوە.

دووەم: ئاینی پیرۆزی ئیسلام داوا لە ئافرەتانی موسڵمان دەکات کەوا قژی سەریان بەربدەنەوەو هیچی لێنەتاشن و کورتی نەکەنەوە تەنها لە حاڵەتی پێویستا نەبێت، "شێخ محمدی کوڕی شێخ إبراهیمی آل الشیخ"ی موفتی دیارو ناسراوی سعودیە "ڕەحمەتی خوای لێبێت" فەرموویەتی دروست نیە ئافرەتی موسڵمان قژی سەری بتاشێ تەنها لە حاڵەتی ناچاریدا نەبێت بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی (( دروست نیە ئافرەتی موسڵمان قژی سەری خۆی بتاشێت)) واتە حەرامە. بە مەرجێ ئەو ئافرەتە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی و زانستی نەبێت. هەروەها مامۆستا علی قارع لەکتێبی (مرقاە المشکات)دا دەفەرموێ ( حەرامە ئافرەت قژی سەری بتاشێ) چونکە قژی سەر بۆ ئافرەت وەك ڕیش وایە بۆ پیاو بەلاّم ئافرەتێك وەك پێویست نەیتوانێت خزمەتی بکات واتە پاك و خاوێنی ڕابگرێ و لەبری بێزاربێت دەتوانێت کورتی بکاتەوە، هەروەك و خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە دوای وەفاتی خۆشەویستەوە قژیان کورت دەکردەوە چونکە پێغەمبەر نەمابوو تا خۆیانی بۆ جوان بکەن و خۆیانی بۆ برازانێنەوە بەلاّم ئەگەر ئافرەتان مەبەستیان لە کورت کرنەوەی قژیان بۆ ئەوەبێ بەناوی مۆدێلاتەوە و لاسای ئافرەتانی ئەمریکا و ئەورووپا بکەنەوە یان مەبەستیان خۆ جوان کردن بێ ئەوە دروست نیەو حەرامە. بەلاّم لێرە دا پرسیارێك

دروست دەبێ ئەویش ئەوەیە کە هەندێ لەئافرەتان قژیان کورت ئەکەنـەوە و دەڵـێن: (أن أزواج النبـی ( صـلي الله علیـه وسـلم) یأخـذنَ مـن رؤسـیهنَ حتـی تکـون الالـوفرة) واتـە خێزانـەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قژیان کورت کردۆتەوە تا سەر گوێیەکانی بەڵام لە وەڵام دا دەڵێم خوێنەری بەڕێز خوشکی ئازیزم ڕاستە خێزانەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) ئەو کارەیـان کـردووە بـەڵام لـە دووای وەفـاتی خۆشەویـستی خـوا کردوویانەچونکە لـەدوای وەفـاتی پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علـی وسـلم) خێزانـە بـەڕێزەکانی خۆشەویـستی خـوا حـوکمی تایبەتی، خۆیان هەبووە، کە هیچ ئافرەتێکی تری سەر ئەم گۆی زەویــە ئــەو حوکمــەیان نــەبووە، هەربۆیــە دروســت نــەبووە خێزانـەکانی پێغەمبـەر دوای مردنـی پێغەمبـەر (صـلی الله علـی وسلم) شوبکەنەوە، ویستی خوای پـەروەردگاریش وابووە وەك و هــەموو ئـافرەتێکی عیـدە دار کەوتونەتــە عیدەیــەکی شــەرعی هەمیشەییەوە، بۆ یە خوای پەروەرد گار لەسورەتی (ئەحزاب) دا ئایەتی (٥٣) دا دەفەرموێ (وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيماً) دەفـەرموێ ئیمـان داران بە هـیچ شێوەیەك ئـازاری دڵ و دەرونـی پێغەمبــەر مــەدەن و دروســتیش نیــە بۆتــان خێزانــەکانی خۆشەویستی خـوا مـارە بکەنـەوە چونکە ئەوانـە دایکـی ئێوەن، کەواتــە حەرامــە خێزانــەکانی پێغەمبــەر (صــلی الله علـی وسـلم)

شوبکەنەوە. هەر ئەمەش هۆکاری ئەوە بوو کە خێزانەکانی پێغەمبەر قژی سەریان کورت کەنەوە ئەو حوکمەش تایبەت بەوانەوە هیچ ئافرەتێکی تر ناگرێتەوە، کەواتە دروست نیە ئافرەتی موسڵمان قژی ببڕێ بەڵکو پێویستە خزمەتی بکات و پارێزگاری لێ بکات. هەروەها دروستیش نیە خڕی بکاتەوە لە سەر سەری خۆی یان لە سەر پشتی ملی دایبنێ بە بەڵگەی ئەم فەرموو دەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە حەزرەتی ئەبو هرێرە گێڕاویەتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەر (صلى الله على وسلم) دەفەرموێ (صنفان مَن اهل النار لمْ ارهُما بعد: قومٌ معَهم سياط كأذناب التبقر يضربون بها الناس ، و نساءٌ كاسيات عاريات، مائلاتٌ مميلات رؤسهنّ كأسنَمَة البخت المائلة، لا يدخلُن الجنة و لا يجيدن ريحها، و أن ريحها ليوجد مِن مسيرة كذا و كذا ))[٢٤] دەفەرموێ دوو کۆمەڵ هەیە لە ئەهلی ئاگری دۆزەخن من ئەم بینیون :-

یەکەم: ئەوانەن کە قامچی و کێبڵیان پێیە وەک و کلکی مانگاوایە ئازاری خەڵکی پێدەدەن.

دووەم: ئافرەتانیکن لە ئومەتەکەم کە بەڕواڵەت جل و بەرگیان لە بەردایە بەڵام ڕووتن کە بەڕێگا دا دەڕۆن لەنجەو لار دەکەن بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆیان ڕاکێشن، یان قژیان لە

---

[٢٤] صحيح مسلم ژمارە ٢١٢٨

سەر پشتی سەری خۆیان کۆدە کەنەوە دەیکەن بە تۆپەڵە یەك وەك و سەر کۆپانی ووشترەوایە. ئەفەرمویٚ ئەم دوو کۆمەڵە لە ئومەتەکەم ناچنە بەهەشتەوەو وە بۆنی بە هەشتیش ناکەن کە بۆنی بەهەشت چەندەها ساڵەرێ دەڕوات. هەندیٚ لە زانایان "ڕەزای، خوایان لەسەر بیٚ" (مائلاتٌ ممیلات) یان بەوە شیکردۆتەوە کە قژیان پێچاو پێچ و لول دەکەن، کە ئەمە شێوازی قژی ئافرەتی فرەنسیەکانە.هەروەها یەکێك لەو شتانەی کە ئەمڕۆ ئافرەتان بەکاری دەهێنن و دەیکەنە سەریان ئەویش قژی دەست کردە ( الشعر الصناعی) کە لە زەمانی ڕەوانی کوردی خۆماندا هەموو ئەو کتێبانەی من خوێندوومەتەوە پێی دەڵێن (یاڕۆکە) ئەمەشیان لە دیدی ئیسلامەوە حەرامە و زانایانی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام لە کۆنەوە قسەیان تێدا کردووە، سبحان الله ئەو زەمانانەی کە زانایان باسیان کردووە زەمانێك بووە کە ئافرەتان قژیان داپۆشیوە وەك و ئەم سەردەمە خەڵك قژی ئافرەتی نەبینیوە، ئەی ئەگەر ئەم سەردەمانە بوایە کە ئافرەتان ئەو موونەیان بۆ جوانی بەکار دەهێنیٚ، کە ئێستە سەدان کارگەو کۆمپانیا بۆ بازرگانی ئەو کارە دەکەن. دەبیٚ چیان بوتایە. ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ووتی:( یارسول الله إن لی إبنة (عریساً) أصابتها حصبَةٌ فَتَمَرقَ شَعرها افأصلِهُ؟ فقال: لَعَنَ الله الواصلِة و المستوصلة)(أخرجة الشیخان و النسائی). ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه

وسلم) من کچێکم هەیە تازە شودەکات بەلاَم نەخۆشی زیپکەو ئاوڵەی هەیە و هەم موەکانی سەری ڕوتاونەتەوە، ئایا دروستە موی تر بەسەریەوە بکەم، خۆشەویست فەرمووی: نەخێر بەهیچ شێوەیەك موو بەسەریەوە مەکە چونکە نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانەیە کە موو بەسەری خۆیانەوە دەکەن و لەو کەسانەش کە ئەو کارەیان بۆ دەکەن، حەزرەتی بخاری لە حەزرەتی عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە دەیگێڕێتەوە ( ڕەزای خوایان لە سەر بێت) دەفەرموێت: کەنیزەیەکی ئەنصاری شوی کرد بەلاَم بە هۆی نەخۆشیەوە موی سەری ڕوتابۆوە کەس و کارەکەی هاتنە خزمەتی خۆشەویستی خوا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە حەز دەکەین قژی تر بۆ کچەکەمان دابنێینەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لعن الله الواصله و المستو صله)[٣٥] نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانەبێ کە مو بەسەری خۆیانەوە دەنێن و لەوانەش کە ئەو کارەیان بۆ دەکەن. بۆچی چونکە بەڕاستی ئەمە جۆرێکە لەغەش کردن و هەڵخڵەتاندن، غەشیش بە هەموو جۆرەکانیەوە حەرامە پێغەمبەری ئیسلام فەرموویەتی (من غشنا فلیس منا)) ئەوەی غەش بکا لە هەرشتێکابێ و خەڵکی فریوبدا لە ئومەتی من نیە واتە لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە، بەلاَم ئەگەر ئافرەتەکە بە هۆی خوریبیەکەوە یان دەزوو ئەو جۆرە شتانە موەکەیان گەیاند بەیەکەوە ئەوە بەر ئەو نەفرینە ناکەوێ هەروەك سەعیدی کوڕی خوبەیر "ڕەزای خوای لەسەربێت"

---

[٣٥] هەموو ئەو فەرمودانە بخاری لە کتێبی (اللباس )دا دەیگێڕێتەوە لە صحیحەکەیدا.

فەرمویەتی ( لابأسَ بالتوصيل ) [٣٦]هیچ شتێکی تیانیە ئەگەر ئافرەت قژی خۆی بەهۆی دەرزی ئاوریشمی و خوری و ئەو شتانەوە بەیەکەوە گەیاند. هەورەوها إیمامی (أحمد) یش "ڕەزای خوا لەسەر خۆی و إمامی هەر چوار مەزهەبەکەبێ" ڕای وایە لە سەر دروستی ئەو حاڵەتە. بەڵام غەیری ئەوانە حەرامە هەروەکو ئەوەی کە (مسلم بخاری) ڕیوایەتیان کردووە کە (معاویە) ( ڕەزای خوای لە سەربێت) هاتە شاری مەدینەو وتارێکی بۆ خەڵکەکەی خوێندەوە، تۆپەڵ قژێکی دەر هێناو فەرمووی ڕاتان چیە بەرامبەر خێزانەکانتان کە ئەم جۆرە قژە لە سەر دەکەن. وەڵاهی بەم گوێیانەی خۆم گوێم لە خۆشەویستی خوا بورە کە دەیفەرموو ( ما من إمرأه تجمل في رأسها شعراً غير إلا كان زوراً) ئەو قژە دەست کردەی کە ئافرەتان لە سەری دەکەن ساختەیەو فرو فێڵەو دروست نیە. ئەنجا دەفەرموێ وڵامی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (إنما أهلكت بنو إسرائيل حين إتخذ هذهِ نساؤهم) فەرمووی خوای پەروەردگار جولەکەی بەنی ئیسرائیلی یەکانی بەهۆی ئەم کارەوە لەناو برد.

سێیەم: حەرامە ئافرەتی موسڵمان موی برۆکانی بکاتو هەندێکی لابباتو باریکی بکاتەوە جابەهۆی داو دەرمان بێت یان مور هەڵکێش بێت پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی

---

[٣٦] لە فتح الباری فەرموویەتی ابوداود بەسەنەدێکی صحیح اخراجی کردووە .

لەو ئافرەتانە کردووە کەمووی برۆکانی هەڵ دەگریٚ جابەهەڵ کیٚشان بیٚت یان بەتاشین و داو دەرمان بیٚت. إبن مسعود صحابەی بەرِیٚزی خۆشەویستی خوا دەفەرمویٚ پیٚغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی (( لَعَن (صلي الله علیه وسلم) النامصة و المتنمصة))[٣٧] نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانە بیٚت کە مووی برۆکانیان هەڵ دەگریٚ بۆ مەبەستی جوانی لەو ئافرەتانەش بیٚت کەمووی برۆکانیان بۆ هەڵ دەگریٚت. إبن کپیر لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە (٣٥٢/٢) دا چاپی (دار الاندلس) لە بارەی برۆ باریك کردنەوە دەفەرمویٚ بە داخەوە زۆربەی ئافرەتان ئەمرِۆ توشی بەلاٚی برۆ باریك کردنو دەمو چاو هەڵگرتن بوونو بەداخەوە بۆتە پیٚداویستیەکی رِۆژانەیانو بە هیچ شیٚوەیك ناتوانن دەست بەرداری بن، هەروەها دە فەرمویٚ: ناتوانیٚ ئافرەت لە سەر رِەزامەندی میٚردەکەشی برۆکانی باریك بکاتەوە ئە گەر فەرمانیشی بە ژنەکەی کرد لەو کاتەدا نابیٚ ئافرەتە کە گویٚرِایەڵی میٚردەکەی بکات چونکە ئەمە سەرپیٚچی خوای تیٚدایەو نابیٚت بە قسەی مەخلو قی خوا سەر پیٚچی خالقەکە بکریٚ کە(الله)یە. بەلاٚم هەندیٚ لە زانایانی حەنابیلە "رِەحمەتی خوایان لیٚ بیٚت " دە فەرموون: ئەگەر میٚرد پیٚ خۆش بیٚت

---

[٣٧] حەلاڵو حرام لە ئیسلامدا ل٩٠ .

ژنەکەی برۆی باریك بێت ژنەکەشی تەنها مەبەستی ڕەزامەندی مێردەکەی بێت لەو حاڵە تەدا دەتوانێت برۆکانی باریك بکاتەوەو موی دەموو چاوی لابەرێت و ئارایشت بکات بەڵام بە داخەوە زۆربەی زۆری ئەو ئافرەتانەی کە ئەمڕۆ برۆیان باریك دەکەنەوە شویان نەکردوە بۆ دەرەوە دەیکەن ئەوەش حەرامە چونکە مەبەستیان ڕەزامەندی مێردەکانیان نیە بێجگە لەوەش لەڕووی زانستیەوە برۆ باریك کردنەوە و دەمو چاو هەڵ گرتن زەرەری هەیە لە سەر تەندروستی مرۆڤ . (تەبەری) لە خێزانەکەی ( أبی إسحاق) دەیگێڕێتەوە دە فەرموێت ئافرەتێك چووە خزمەتی دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە ( ڕەزای خوای لە سەر عائیشەو هەموو خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا بێت ) وتی ئەی دایکی ئیمانداران من ئافرەتێکم تازە شوم کردووە دەم و چاوم موی زیادەی پێوەیەو مێردەکەشم حەز ناکات موی پێوە بێت ئایا ئەتوانم لای بەرم فەرموی بەڵێ هەتا دەتوانی ئەوەی ئازاری بۆت هەیە ئەتوانیت لای بەریت و خۆت بۆ مێردەکەت جوان بکەیت کەواتە حەدیسەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە نەفرینی لەو ئافرەتانە کردووە کە برۆیان باریك دەکەنەوەو موی دەم و چاویان هەڵ دەگرن بۆ دەرەوەیە بۆ ئەوەی خەڵك سەیری بکات وە بۆ مەبەستی مێردەکەی نیە. کە نەفرینی لەو ئافرەتانە کردووە کە برۆیان باریك دەکەنەوەو موی دەم و چاویان هەڵ دەگرن بۆ دەرەوەیە بۆ ئەوەی خەڵك سەیری

بكات وە بۆ مەبەستی مێردەكەی نیە. إنشاء الله ئەو ئافرەتانەی كە بۆ ڕەزامەنی مێردەكانیان دەی كەن بەر ئەو نەفرینەی خۆشەویست ناكەون( والله أعلم) .

چوارەم: حەرامە ئافرەتی موسڵمان خاڵ لە سەر جەستەی خۆی بكوتێ پێغەمبەری سەروەر (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەش كە خاڵ دەكوتن و ئەوانەش كە بۆ یان دەكوتن، شوێنی كوتانەكەش بەلای ئیمامی شافعیەوە دەبێت لا ببرێت ئەگەر مەترسی گەورەی بەدوایا نەدەهات. وەك و لە دەست دانی ئەندامی لاشەی یان پەڵە و نیشانەیەكی ناشرین كە بكەوێتە لاشەیەوە ئەو كاتە واجب نیە خاڵەكە لاببات لە فەرموودەی "صحیح"ی إبن مسعود هاوەڵێ خۆشەویستی خوا دە فەرموێ ( لَعَن "صلي الله عليه وسلم" الواشمة والمستوشمة) دە فەرموێ پێغەمبەری أكرم ( صلى الله عليه وسلم) نە فرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی كە خاڵ لە سەر لاشەی خۆیان دەكوتن و لەوانەش كە خاڵیان بۆ دەكوتن. لە زەمانی جاهیلیەتی پێش ئیسلام دا عەرەبەكان زۆربەی لاشەیان بە خاڵ نەخش كردووە تەنانەت وێنەی خواوەندو شاعیرو زاناكانیان لەسەر لاشەیان بە خاڵ كێشاوە هەروەك چۆن دەبینن وێنەی خاچو مەسیحیان لەسەر لاشەیان دەكێشن وە سەرە ڕای ئەو كەسانە ئازارێكی زۆریان پێدەگات بە داخەوە لە سەر دەمی كرانەوەی دونیای عەولەمەدا ئەم نەریتە جاهیلی و نەفامیانە زیندوو بونەتەوە و

زۆر جۆریش تە لە فیزیۆن و ڕۆژنامەو گۆڤار سەتەلایتەکان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە ناوی پێشکەوتنەوە بازاڕی ئەم جۆرە نەریتە نەفامیانە ڕەواج پێدەدەن.

پێنجەم:حەرامە ئافرەتی موسڵمان دانەکانی شاش و واش بکات بۆ جوانی بەواتایەکی تر جیهازو ئامێری پێشکەوتوی لێبدات و لەم لاو لایان بگرێت تاوەك و بۆشاییەکی کەمیان دەکەوێتە بەینەوە ئەوەش بۆ دوو مەبەست یان بۆ جوانی یان بۆ ئەوەی بڵێن گەنجە، ئەمەش دروست نیە چونکە فریودان و خەڵەتاندنی تێدایە هەرکارێکیش فریودان و خەڵەتاندنی تێدابێت حەرامە هەروەك و لە فەرمودەی إبن مسعود دا هاتووە کە بۆمان دە گێڕێتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی (لعن الله النامصات و المتنامصات و المنفلجات للحسن و المتغيرات للحسن) واتە: نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانەی کە دانیان شاش و واش دەکەن تەنهاش بەمەبەستی جوانی، وە ئەو کەسانەش کە ئەو کارەیان بۆ دەکەن هەروەك خوای پەروەرد گاریش لە سورەتی (حەشر) ئایەتی (٧) دا دەفەرموێ (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) ئەوەی پێغەمبەری خوا بۆی هێناون وەری گرن و جێبەجێی کەن دوریش کەونەوە لەوەی قەدەغەی کردووە لێتان هە رکە سێکیش گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری نەکات خوا سزای توندی دەدات.کەواتە بە فەرمودەی خۆشەویستی خوا حەرامە

ئـافرەت دانـەكانی شـاش و واش بكـات بـۆ جـوانی تـەنها ئـەو ئافرەتانـە نـەبێت كـە بەشـێوەیەكی سروشـتی دانـەكانیان خـوارو خێچ بۆ ناوەوە یان بۆ دەرەوە دەر پەڕیوە و پێویستیان بە كاری نەشتەر گەری هەیە بۆ ڕاست كردنـەوەیان یـان كلـۆر بـوون و پێویستیان بە پڕكردنـەوە هەیە هیچ مە بەستێكی جوانی و پۆز پێوە لێدانیان نیە ئەوە دروستە بەڵام ئەحمـەد كاكە محمـود لـە كتێبەكەی خۆیدا بەناوی ( ژنان و كارو باری ژنـان لـە ئیسلام دا) دە فەرموێ لە بەر ئەوەی دینـی ئیسلام گرنگـی تـەواوی داوە بـە مرۆڤ و مە سەلەی خۆ جوان كردن لـە بـەر ئەوە حەڵاڵـە بۆ ژن و پیاو كە نەشتەر گەری جوان كاری بكا بە بەڵگەی ئەوەی لە كاتی ڕو داوێك دا (عرفە جەی كوڕی سەعد) لـوتی بڕابوو پێغەمبـەر ( صلى الله عليه وسلم) فـەرمانی پێكـرد بـچێت لـە ئـاڵتون لـوتی دروست بكاتەوە ، ئیمامی (ختابیش) لە تەفسیری ئەم فەرمودەیـەدا دەفەرموێ: ژن و پیاو ئەتوانێت ئەندا زەیەكی كەم لە زێڕ بـەكار بێنێ بۆ ئـەو جـۆرە شـتانە هـەروەها لـە كتێبی (المجموع) [٣٨] دا هـاتوە كـە دەڵێـت (يجوز لن ذهب أنفه أو سنه أو نملته أن يتخذ مكانها ذهباً سـواءاً أمكَنَـهُ فـضة و غيرهـا أم لا) دە فـەرموێ: دروسـتە مرۆڤـ دەسـكاری دەم و چـاو و لـوت و گـوێ و هـەر ئەنـدامێكی تـری لاشـەی بكـات و حەڵاڵـە لـە شـەریعەتی پـیرۆزی ئیسلامدا بـە ( تغير خلق الله) دانانرێت.

---

[٣٨] ژنان و كاروباری ژنان لە ئیسلامدا احمد كاكە محمود چاپی یەكەم ل.٢٦١

شەشەم: یەکێك لەو شتانەی کە ئەمڕۆ بۆتە عادەتو زۆربەی ئافرەتی موسڵمان دەیکات ئەوەیە کە ئافرەت دەستو پەنجەو کوڵم و چاو و لێوەکانی بۆیە دەکات لەم بارەیەشەوە زانایانی ئیسلام دە فەرموون حەرامە ئافرەتی موسڵمان پێڵوی چاوی سەرو ژێری، کوڵمو لێوە کانی ئارایشت بدات بەلاّم هەندێکی تر لە زانایان دەفەرموون دروستە ئافرەتێك کە مێردی خۆی هەبێت خۆی بۆ ئارایشت بدات مەبەستیش لەو کارەی تەنها خۆ جوان کردن بێت بۆ مێردەکەی، چونکە خۆشەویستی زیاد دەکات. بەلاّم ئەو ئافرەتانەی کە ئەمڕۆ وەك عادەت دەیکەن شویان نەکردووە یان بۆ دەرەوە دەیکەن دروست نیەو حەرامە بەلاّم بۆ یەکردنی نینۆکە کان دروستە بۆ ئافرەتی مێرد دار کە ئیمامی نەوەوی لە( المجمع)دا لە لاپەڕە (٣٢٤) بەرگی (١)دا باسی ئەو فەرمودەیە دە کات کەحەزرەتی ابو هریرەی هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەی گێڕێتەوەو دە فەرموێ یەکێك لەخێزانە بەڕێزە کانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی من حەزم لەبۆیە کردنی پەنجەی دەستو قاچەکانم نیە چونکە خۆشەویستەکەم کە پێغەمبەری خوایە(صلی الله علیە وسلم) ڕقی لە بۆنەکەی دە بێتەوە بەلاّم ئەی خوشکی بەڕێزم بۆ پەنجەی دەستو قاچت لەخەنە ناگریت کەحەزرەتی عائیشەی دایکی ئیمانداران دەفەرموێ: ڕۆژێکیان ئافرەتێك هات بۆ ماڵمانو باسی حاڵ و گوزەرانی خۆی کرد و لەبارەی خۆیەوە نامەیەکی

پێ بوو دەستی درێژکرد نامەکە بدات بەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) کێشەکەی بۆ چارە سەرکات خۆشەویست دەستی درێژکرد نامەکەی لێوەرگرێت فەرموی: (ما أدری أید رجل أم ید إمرأة) ئەی عائیشە ئەرێ ئەوە دەستی پیاو بوو یان ئافرەت فەرمووی: هی ئافرەت بوو فەرمووی: ( لو کنت إمرأة لغیرتە أظافرك) فەرمووی: ئەگەر ئافرەتی چاك بوایە دەبوو پەنجەکانی خەنەی پێوە بوایە. خۆشەویستان بۆ یەی نینۆکە کان دەبێت بۆیەو دەرمانێك نەبێت کە چەوربێت توێژاڵێك لە سەر نینۆکە کان دروست بکات یان لە سەر پێستەکەی دروست بکات چونکە ئەو کاتە نایەڵێت ئاو بگاتە ژێر نینۆکە کە یان ژێر پێستەکەو پاك نابێتەوە بەڕاستی ئەم جۆرە بۆیانە نەك بۆ ئافرەت بۆ پیاویش حەرامە.

حەوتەم: هەروەها حەلاڵ نیە بۆ ئافرەتی موسڵمان قژی سەری بۆ یە بکات بەلاَم ئەگەر پیر بوو بوو چوبووە تەمەنەوە دروستە بە مەرجێك بەڕەنگی ڕەش بۆیەی نەکات. حەزرەتی ئەبوو بەکری صدیق (ڕەزای خوای لە سەر بێت) باوکی ناوی (ئەبی قەفاحە) بوو لە فەتحی مەکدا هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) کە خۆشەویستی خوای بینی هەموو موەکانی سەری سپی بووە،فەرمووی ئەم ڕەنگە بگۆڕن بەو مەرجەی ڕەنگی ڕەش نەبێت، لەمەوە زانایان (ڕەحەتی خوایان لەسەربێت) دەفەرموون حەرامە ئینسانی پیر موی سەرو ریش و سمێڵی ڕەش بکاتەوە

(الزهـری) دەفـەرموێ ئـەو کاتـەی کـە ئێمـە گـەنج بـووین سـەرو ڕیش و سمێڵیان ڕەش دەکردەوە، کاتێکیش دە چوینە تەمەنەوە وازمان لێدەهێنا هەندێك لـە صحابەکانیش (ڕەزای خوایان لـە سەربێت) ڕێگایان داوە بە ڕەش کردنەوەی قژی سەر و ڕیش و سمێڵ بەڕەنگی ڕەش وەك (سعدی قوری وەقاس، عقیـەی کوڕی عـامر، حەسـەن و حـسێن ی کـوڕیی ئیمـامی علـی و کـچەزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) هەروەها بوخاری لە ئەبو هریـرەی هـاوەڵی پێغەمبـەری خـوا دەی گێڕێتـەوە دەفـەرموێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی (إن الیهـود و النـصاری لایـصبغون فخـالفُوهُم) جولەکـەو گاورەکـان سـەرو ڕیـشیان بۆیـە ناکەنـەوە ئێـوە بـە پێـچەوانەی ئەوانـەوە ڕەشـی بکەنـەوە بـۆ یـە(حـەزرەتی ئـەبوبکر و عمـر و هەنـدێکی تـر لەصحابەکان ئەم کارەیان کردووە.

بەڵام هەندێکی تر لـەزانایان فەرمویانـە: دروست نیە موسڵمان سەرو ڕیش و سمێڵی ڕەش بکاتـەوە تـەنها لـە حاڵـەتی جەنگ و تێکۆشان دا نـەبێت بەمەبەستی ترساندنی دوژمن تـاوەکو بڵێن سـەربازەکانی ئیـسلام هـەمویان گـەنج و لاون. هـەروەك و ئـەو فەرمودەیەی (ابو پور) دەی گێڕێتەوەو دەفەرموێت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسلم) فەرمویەتی ( إنَّ أحسَنَ ما غَیرتُم بهِ الشَّسبُ الحناءُ الکَتم ) چاکترین شتێ کـەڕەنگی سپی پـێ بگـۆڕن ڕەنگـی خەنـە و کەتەمـە، هەرچـەندە خەنـە ڕەنگـی سـورە بـەڵام

(کەتەم) ڕووەکێکە لە وڵاتی یەمەن دەڕوێ و ڕەنگی ڕەش دەر دەکاتو زیاتر بەلای مۆردا دەڕوانێت. هەروەها (شێخ صالح الفوزان) لەم بارەیەوە دەفەرموێ دروست نیە موسڵمان موی سەرو ڕیشی ڕەش بکاتەوە چونکە ڕەنگی ڕەش زینەت و جوانی تێدایەو دەرونی مرۆڤیش حەزی پێدەکات.

هەشتەم: دروستە ئافرەتی موسڵمان لەسنوری خۆی دا جلو بەرگی جوانو خاوێن لەبەرکات، خوای پەروەرد گار لە ئایەتی سیو دووی سورەتی أعراف دا دەفەرموێ: ( قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ) ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بە ئومەتەکەت ڕابگەینە کە هیچ کەسێ بۆی نیە ڕێ لە پاکو خاوێنی و خۆ جوان کردنی موسڵمانان بگرێ، ئەوەندەی ئاینی ئیسلام گرنگی بە پاکو خاوێنی و خۆ جوانکردن داوە هیچ بەرنامەو پرۆگرامێکی سەر ئەم زەوی یە گرنگی پێ نەداوە، زۆربەی زانایانی ئیسلام دەفەرموون: دروستە ئافرەتی موسڵمان زێڕو زیوو خشڵ بەکار بێنێ، بەتایبەت ئافرەتی مێردار بەو مەرجەی ئەو زێڕو زیوو خۆ جوان کردنەی بۆ پیاوانی نامەحرەم نەبێت، چونکە حەرامە پیاوی موسڵمان گوێی لەدەنگی خشڵو خڕخاڵو زێڕو زیوو دوگمەو دۆلابو گۆبەرۆکو ئەوانەبێ، تەنانەت ئەو ئافرەتانەی لە ژێر عەباو شتی وا شەوە لەبەری دەکات دەبێت زۆر هەوڵ بدات

دەنـگـی خرینـەی لێـوە نایـەت. خۆشەویـستان ئافرەتـان بـە شێوەیەکی سروشتی حەزیان لە خشڵو زێڕو زیوە لەو بارەشەوە خـوای پـەروەردگار لـە ئایـەتی حەڤـدەی سـورەتی زخـرف دا دەفەرموێ (أَوَمَنْ يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ) دەفەرموێ دروستە زێڕو زیو ئاوریشم بۆ ئافرەتـان بەڵام حەرامە بۆ پیاوان، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ (حرّم لباس الحرير و الزهب على ذكور اُمتى وَاُحِلَ لاَ ناثهم) حەرامە پیاوی موسڵمان جلو بەرگی ئاوریشم لەبەر کات، ئەم فەرمودەیە ئیمـامی ترمـزی گێڕاویەتـەوە. ئەگـەر بەوردی و واقعـی سـەیری پێکهاتـەی ئـافرەت بکـەین دەبیـنین ئـافرەت بـە سروشـتی خـۆی حـەزی لـەزێڕو زیـوو خۆجوان کردنـە، ئیتر هـەر پلـەو پایەیـەکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی ڕۆشـنبیری هـەبێت، تەنانـەت جیـاوازی شـوێنو جوگرافیـاش ئـەو حـەزەیان نـاگۆڕێ بـۆ یـە دەبینـی ئافرەتێـك دکتـۆرا یـان فـوقی دکتـۆرای هـەبێ لەگـەڵ ئـافرەتێکی نەخوێنـدەوارا وەكو یـەك حـەزیان لـەزێڕو زیـو خۆڕازاندنەوەیـە بەمەبەستی ئەوەی شیرن بن لای پیـاوان. کەواتـە ئـەو ئافرەتانـەی کە خۆیان ڕووت دەکەنەوە ئەوەیە خۆیـان لـە دڵـی پیاوان دا جێ بکەنەوە.

ب- لەڕووی تەندروستی یەوە :-

دیارە شتێکی بەڵگە نەویست و حاشا هەڵ نەگرە ، کە ئافرەتی ئیماندار حیجابی شەرعی دەپۆشێت ، لەترسی نەخۆشی یە کوشندە کان نیە بەڵکو تەنها لە ترسی خوایەو دەبێ فەرمانی خوای گەورە جێ بەجێ بکات ، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەمری بە ئافرەتان کردووە کە پۆشاکی شەرم و حەیا لەبەربکات و جوانی و ڕازاوەیی خۆی بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرنەخات ، تەنها هاوسەری حەڵاڵی خۆی نەبێت ، ئەوجا مەبەستی دووەمیش لەوەی کە ئافرەتی ئیماندار پۆشاکی شەرعی لەبەردەکات بۆ خۆپارێزی یە لە نەخۆشی ، کەواتە لێرەوە خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویستم بە پشتیوانی خوای پەروەردگار ئێستا باسی زیانەکانی ڕووتی و قوتی دەخەینە بەر دەستی ئێوەی بەڕێز بەئومێدی ئەوەی هەمووڵایەك بە تایبەتی خوشکان و دایکانی ئازیز سودی لێوەرگرن .

**یەکەم : زیانەکانی ڕووتی و قوتی ( سفوری ) :-**

گۆڤاری (B,M,J ) کەگۆڤارێکی بەناوبانگی جیهانیە ژمارە یەکی ئەم گۆڤارە لەبەرواری ١٩٧٢/١/١٥ دا دەرچووە لەلاپەڕە ( ١٢٠ ) دا دەڵێت: نەخۆشی شێرپەنجە ( المیلانو الخبیثة ) ( Malignat melanoma) زۆر بەڕاشکاوی دەڵێت : لە ڕابردوودا ئەم نەخۆشی سرگانە زۆر کەم بووە بەڵام ئێستا بەپێ ی ئامارە پزیشکی یەکان لە پەرەسەندنی بەردەوام دایە، ئەمەش بەزۆری توشی ئەو ئافرەتانە

دەبێت کە قاچ و قولیان ڕووتەو بەدرێژای ساڵ گەرماو سەرماو تیشکی خۆر لێ ی دەدات. جا خوێنەری بەڕێز بە وردی سەیرکە ئەم گۆڤارەکە باسی ساڵەکانی حەفتاو هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو دەکات . ئەی ئەبێ ئەمڕۆ ئامارە پزیشکی یەکان بڵێن چی کە ئەمڕۆ بەهۆی کرانەوەی زیاتری دونیا بەڕوی یەکتری دا بەهۆی سیستەمی عەولەمەوە کە دونیا وەك و گوندێکی بچوکی لێهاتووە ئافرەتان بەهۆی فلیم و کەناڵەکانی سەتەلایتەوە زیاتر ستریچ و کوڵۆن و گۆرەوی درێژ لەپێ دەکەن، لەوانەشە زۆربەی خوشکان ئەو پرسیارە بکەن و بڵێن ئەمڕۆ ئافرەتان پانتۆڵی کابۆمینی جۆبری تەسك و سێ چارەك لەپێ دەکەن لەوڵامی ئەو پرسیارەشدا دەڵێین: الحمدالله ئەمڕۆ زانستی پزیشکی ئەو ڕاستی یە زانستی یەشی سەلماندووە کە جلی تەنگ و تەسك کاریگەری زۆری هەیە لەسر توشبونی ئافرەت بەنەخۆشی یە جۆراو جۆرەکان .

**دووەم: زیانەکانی ئارایشت لەسەر پێست:**

دکتۆرە ( وهبة احمد حسن ) مامۆستای کۆلێجی پزیشکی یە لەزانکۆی ئەسکەندەریەی مصر ئەڵێت: ئارایشتەکانی ئافرەت وەك و سوراو سپیاو کاریگەری زۆر خراپیان لەسەر پێستی ئافرەت هەیە چونکە ئەو مادانەی کە ئارایشتەکانی لێدروست دەکرێت پێکهاتووە :-

١- لەماددەی کانزای قورس وەك قورقوشم و جیوە

٢- پێکهاتووە لە مادە چەوری یەکانی وەك و زەیت .

٣- پێکهاتووه له بەرووبوومه پەترۆڵی یەکان:

بە پێی ڕێنمایی یە زانستی یەکانیش ئەمانە هەمووی زیان بە پێستی ئافرەت دەگەیەنێت، چونکە کاتێ کە ئافرەت ئارایشت دەکات پێست لە ڕێگەی کونیلەکانەوە ،هەموو ئەو مادە زیانبەخشانە هەڵ دەمژێت و دواجار دەبێتە هۆی هەوکردنی لەش و توشبون بەنەخۆشی یە هەستەوەریەکان . بە واتایەکی تر ئافرەتەکە توشی حەساسیەت دەبێت ، ئەمەش ڕاستی یەکی زانستی یە ئەبێت خوشکان و دایکان لێی ئاگاداربن. ئەگەر وازنەهێنن و بەردەوام بن لەسەری کاریگەری زۆر خراپی بۆسەربەشەکانی خوێن و گورچیلەکان دەبێت .

هەروەها دکتۆر (حسن الحنفاوی) کە یەکێکە لەو دکتۆرە بەناوبانگەکانی پێست لە جیهان دا دەڵێت: نەخۆشی یەکانی پەڵەی پێست بە زۆری لەناو ئەو ئافرەتانەدا بڵاو دەبێتەوە کە زیادە ڕەوی دەکەن لە بەکارهێنانی جۆرەکانی ئارایشت وەك و کرێم و مەرهەم و قەڵەمی لێو و نینۆك و عەترەکان، هەروەها دکتۆر ( یعقوب سلیمان ) ئەویش یەکێکە لەدکتۆرە بەناوبانگەکانی پێست لەشاری موصڵ دەڵێت: توێژینەوە پزیشکی یەکان لە سەرتاسەری جیهان ئەو ڕاستیەیان سەلماندووە کە زۆربەی نەخۆشی یەکانی پێست لەناو ئافرەتاندا لە ئەنجامی بەکارهێنانی دەرمانەکانی ئارایشتەوەیە چونکە ئەو بەرهەمانە چەندین جۆری مادەیی کیمایی جیاوازی تێدایە کە

پێستی لەش دەسوتێنێتەوە و هەندێ جار کەسەکە توشی نەخۆشی بیرۆ دەکات ، باوەڕتان هەبێت من بۆخۆم پیاوێك دەناسم کە لەسالّی ( ٢٠٠٠ – ٢٠٠٢ ) خەنەی هیندی بۆ ڕەشکردنەوەی موی سمێڵی بەکاری دەهێنا بەلاّم لەدوای ئەوەی چەند جارێك بەکاری هێنا، پێستی توشی حەساسیەت بوو ئێستاشی لەگەڵدا بێت، پێستی توشی بیرۆ بووە و چەند جار سەردانی دکتۆری پسپۆڕی پێستی لە شاری سلێمانی کردووە چارەسەری نەبووە و پێیان ووتووە توشی بیرۆ بووی، ئەمەی کە باسم کرد پیاوە ئەی ئەبێ حالّی ئەو ئافرەتانە چۆن بێت کە بەردەوام ڕۆژانە بۆ بازاڕ بۆ دائیرە بۆ سەردان ئارایشت و سوراو سپیاو دەکاو مەڵهەم و کرێم بەکاردەهێنێ پسپۆڕە بەناوبانگە جیهانیەکانی پێست لە زانکۆی (کالیفۆڕنیا) لە سان فرانیسکۆی ئەمریکا ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە بەکارهێنانی ئارایشت و کرێم و بەرهەمەکانی تری خۆ جوان کردن لەکاتی پیر بوون دا دەبێتە هۆی زوو پیر بوون و دەرکەوتنی چرچ و لۆچی پێست .

جـ- لە ڕووی ئابوری یەوە :-

بێ گومان لەووڵاتە دواکەوتوەکاندا ئافرەتان زیاتر بایەخ بە جل و بەرگ و خۆ ڕازاندنەوە دەدەن لە چاو ئافرەتان لەوڵاتە پێش کەوتووەکاندا، بەداخەوە ئامارێکی ڕاست و دروستم لەبەر دەستدا نیە بزانم ژمارەی ئارایشتگاو سەنتەرەکانی لەش جوانی

و خۆڕازاندنـەوە چـەندە لـە وولآتـانی ئیـسلا مـی دا ، بـەلآم بـۆ نموونە تەنها لە شاری سلێمانی دا ساڵی ( ٢٠٠٢ ) چوارسـەد و پەنجا صالۆن بەڕەسمی إجازەیان لەلایـەن حکومەتـەوە پێدراوە ، هـەروەها لـە سـاڵی ( ٢٠٠٩ ) هەشـت سـەدو پـەنجا صـاڵۆن إیجازەیان پی بەخشراوە، ئەمـە بێجگـە لـەو هـەموو سـەنتەرانەش کە خەریکی عەمەلیاتی جوانکاری لـەش و لارو لچ و لێوو دەم و ددانەکانن،گۆشت لەلەشـی دەگـرن و لێـوی بۆ ئەستور دەکـەن و سنگی بۆ گـەورە دەکـەن و چاوی عەدەسـەی جوانی بۆ دادەنێن چـاوی بـۆ ڕەش دەکـەن و بـۆی شـین دەکـەن واتـە: حـەزی لـە چ ڕەنگێکـە ئـەو جـۆرە عەدەسـەی بـۆ دادەنـێن . بەڕاسـتی ئەگـەر بەدیدێکی ئابوریانەوە سەیری ئەم مەسەلەیە بکەین ، ئەم هـەموو پارەیـە کـە لـەم شـتانەدا سـەرف دەکرێـت بۆخـۆی بۆجەیـەکی زەبەلاحـە ، وەلآهـی ئەگـەر نیـوەی ئـەم پارەیـە بەشـێوەیەکی خێرخـوازی کۆبکرێتـەوە دەیـان قوتابخانـە و نەخۆشـخانەی پـێ دەکرێتـەوە، یـان دەیـان سـەنتەری زانـستی و پزیـشکی پـێ دەکرێتەوە، بەو هۆیەشەوە دەتوانرێـت دەیـان نەخۆشـی هـەژاری پێ چارە سـەربکرێت کـە شـەوانە لـە شاشـەی تەلەفزیۆنەکانـەوە دەیان بینین .!. بـەلآم بەداخـەوە ئەوەنـدەی صـاڵۆن و سـەنتەری خـۆ جوان کردن و ئارایشتگامان هەیە ، نیو ئەوەندە سەنتەری زانستی و بەردی گورچیلەو قەسـتەری دڵمـان نیـە ،من نـاڵێم با ئـافرەت گرنگـی بەلایەنی خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی خـۆی نـەدا ؟ نـەخێر بەلآم من

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە ئەوەندەی ئافرەتی شەرقی و وولاتانی ئیسلامی پارەو پولی خۆیان بۆ ئارایشت و سوراو سپیاو ماکیاژ بەکاردەهێنن ، بەنیوەی ئەو پارەیە دەیان و سەدان پرۆژەی ئابوری لەم ولاتانە دا پێ بەرهەم دەهێنرێت ، یعنی هەروای لێهاتووە ئافرەت بەناوی مۆدێلاتەوە ئەبێ سوراوپێلاو قاتەکەشی یەك رەنگ بێ بە واتایەکی تر کاتێ ئافرەتێك دەچێت بۆ بازار سوراوێ بکرێت بە ناچاری ئەبێ پێلاوێکیشی بۆ بکڕێ دواتر چاکەت و کراسێکیشی بۆ بکڕێ چونکە مۆدێلەکەی وایە ئەبێ هەمووی لەیەك رەنگ بێت ، بۆیە هەندێ لەو خوشکە بەرێزانەی لە دائیرەکانا مامۆستایە یان موظفە لەگەڵ حورمەتم بۆ ئەو پیشانە کەهەمووی پیشەی پیرۆزن بەلام بەداخەوە موچەکەی هەربەشی ئارایشتەکانی ناکات ، خوشکی واهەیە معاشەکەی چوارسەد هەزارە بەلام مانگانە پێویستی بە پێنج سەد هەزار دینارە بۆ پێویستی یەکانی سوراو سپیاو و عطر و عطور، بۆ نمونە رۆژێك گۆڤاری کەپرم خوێندەوە لە لاپەرە (١٣) دا باسی بابەتێك دەکات بەناوی ئارایشتگای ژنان و وەرگرتنی پارەی خەیاڵی !!!. ئەڵێت زۆرجار خاوەن ئارایشتگاکان لەیەك بۆیەکردنی نینۆك و مێش کردن و ماکیاژدا پارەیەکی خەیاڵی وەردە گرن ، جاری واهەیە لە جوانکاری بوکێك دا ( ٤٠٠) دۆلاری ئەمریکی وەردەگرن هەندێ جاریش یەك جار جوانکاری بۆ ئافرەتان بە ( ١٠٠ ) هەزار دینار دەکەن واتە ئەگەر خوشکێك مانگی پێنج جار بچێتە ئارایشتاگەیەك مەعاشەکەی لەسەری قەرزار دەبێتەوە ؟!؟

# بەشی چوارەم

## یەکەم : بۆن خۆشی ئافرەتان(الطیبُ النّساء )

خۆشەویستان بەکار هێنانی بۆن خۆشی بۆ ئافرەتانی موسڵمان کارێکی شیاو (مستحب)ە، حەزرەتی عائشە دەفەرموێ (کُنتُ أَطیبُ (رسول الله بأَطیب مایجد حتی أَجد و بیص الطیب فی شعره و الحیتهِ ) [٣٩] پێغەمبەرم بینی ( صلی الله علیه وسلم) بە خۆشترین بۆن خۆی بۆن خۆش دەکرد بەشێوەك دەم بینی مووەکانی ڕیشی بریسکەیان دەهات. ئەبو سعیدی خودری " ڕەحمەتی خوای لێ بێت" دەفەرموێت باسی ژنێکیان کرد گوایە ئەنگوستیلەکەی بەمیسك ناوەخن کردووە فەرموی ( و هُو أَطیبُ الطیب ) فەرمووی با بەکاری بێنێ چونکە میسك لە هەموو بۆنەکان خۆشترە، کەواتە بۆن خۆشی بۆ ئافرەتانیش حەڵاڵە بەڵام بۆنی پیاوان جیاوازە لە بۆنی ئافرەتان ، بۆنی پیاوانیش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ (طیبُ الرِّجال ماظهَرَ ریحه و خَفی لونهُ ) بۆنی هەیەو ڕەنگی نیە وەك و گوڵاو هی ئافرەتانیش ئەوەیە ( طیبُ النساء ماظهَرَ لونهُ

---

[٣٩] امامی البخاری ئەم حدیثە ی گێڕاوەتەوە

وخفی ریحه) [40] بۆنی نیەو ڕەنگی هەیە وەك زەعفەران واتە: بۆنەکەی بەس بۆ خۆیەتی و بۆ دەورو بەری بلاو نابێتەوە سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆی ڕاناکێشێ ، محمدی شوکانی دەفەرموێ: لەفەرمودەی پێغەمبەردا ( صلی الله علیه وسلم) هاتوه ئەو ئافرەتەی کە بەناو کۆڕو کۆمەڵ و بازاڕو شوێنە گشتیەکاندا دەڕوات و بۆنی خۆشی ئەچێ بەسەر خەڵکا بە زیناکار دانراوە، بەڵگەشمان ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی (( عن أبی موسی (رضی الله عنه) عن النبی (صلی الله علیه وسلم) قال: کُل عین زانیة، و المرأة إذا إستعطرت، فمرت بالمجلس کذا و کذا ، یعنی زانیة......... . رواه ابو داود و الترمذی و قال حدیث حسن صحیح . رواه النسائی و إبن خُذیمه و إبن حبان فی صحیحه ، و لفظهم : قال النبی (صلي الله عَليه وسلم) أیُما إمرأة إستعطرت، فمرة علی قوم لیجدوا ریحها فهی زانیة و کُلُ عین زانیة . رواه الحاکم ایظاً و قال صحیح الأسناد......) هەر ژنێك خۆی بڕازێنێتەوە بۆنی خۆش لە خۆی بدات و پاشان بچێتە ناو بازاڕو شوێنی کۆڕ و کۆبونەوەکان بە مەبەستی ئەوەی سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆی ڕاکێشێ پەنا بەخوا ئەو ئافرەتە گوناه بارەو ئەتوانرێت پێی بوترێ زیناکار بەواتای هەموو چاوێ زینا دەکات و زینای چاویش تەماشاکردنی

[40] رواه النسائی والترمذی عن ابی هریرة قال: الترمذی حدیث حسن احکام النساء لإمام احمد.

ئافرەتی نامەحرەمە هەروەها حەزرەتی ئەبو هریرە (ڕەزای خوای لـە سـەربێت) بۆمـان دەگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی (أبی هریرە (رضی الله عنە) و عن موسی بن یسار (رضی الله عنە) قال: مَرَتْ بأَبی هريرە إمـرَأةٌ و ريحها تعصِفُ، فقال لها: أين تريدين يا أُمة الجبار؟ قالت: إلى المسجد قال: و تَطيَبْتَ؟ قالتْ:نعم قال: فارجعي فاغتسلي فأني سمعتُ رسول الله (صلي الله عليه وسلم) يقولُ : لايقبلُ الله من إمـرأة صلاة خرجت إلـي المسجد وريحها تعصف حتـى يرجع فتغتسل) [41] ئافرەتێـك بـەلای ابـو هريـرە دا تـێ پـەڕی و بـۆن و بەرامەکەی بە سەرو لوتیا هەڵ چوو ئەبو هریرەش بانگی کردوو فەرمووی دەچیت بۆ مزگەوتیش و ئەم هەمو بۆنەت لە خۆت داوە وتی: بەڵێ . فەرمووی: زەحمەت نـەبێ جارێ بچۆ ماڵێ و خۆت بشۆ و ئینجا وەرەوە بۆ مزگەوت چونکە من بەم گوێیانـەی خۆم لـە دەمـی پێغەمبـەرم بیـستوە ( صـلی الله علیـە وسـلم) کـە فەرموویـەتی خـوای گـەورە نوێـژی ئـەو ئافرەتـە قبـوڵ ناکـات کەدەچنە مزگەوت و بۆنی خۆشیان لـە خۆیان داوە بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆیـان. هـەتاوەك و ئەو بۆن و بەرامە لـە خۆیـان نەکەنـەوە ئەگەر بەوردی سـەیری فەرمودەکەی پێغەمبـەر ( صـلی الله علیـە وسـلم) بکـەین دەبیـنین خۆشەویـست

[41] رواه ابن خزيمة في صحيحه ورواه ابي داود وابن داود وابن ماجه من طريق عاصم بن عبدالله العمري

وشەی مزگەوتی بەکار هێناوە کە لێرەدا وشەی مزگەوت گشتیەو هەموو شوێنێك دەگرێتەوە کەواتە: پێویستە هەموو ئەو خوشكو دایکە بەڕێزانەی کەشان بەشانی براکانیان ڕولەمزگەوتەکان دەکەن بۆ بەجێ هێنانی دروشمی جومعە و بۆنەو جەژنەکان بە هیچ جۆرێك ئەو بۆنانە لە خۆیان نەدەن کە بۆن و بەرامەکەی دەڕوات.

دووەم: هۆکارەکانی رووتی و قووتی و (سفوری)

خۆشەویستان ڕوت و قوتی و خۆ دانەپۆشین سیمای ژیانی سەرەتای مرۆڤایەتیە هەرکەسێ تۆزێك شارەزایی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەبێت دەزانێ کەیەکەمجار ژیانی مرۆڤ لە سەر ئەم زەویە ڕوت بووە کاتێك کە مرۆڤ ژیانی لە ناو ئەشکەوت و شاخەکان بوە پووت بوە دوای کە هاتە ناو دەشتەکان و خانو و بینای دروست کرد تۆزێ پێشکەوت ئینجا گەڵاو گوڵی درەخت و پێستە و کەوڵی ئاژەڵەکانی هێنا و عەورەتی خۆی پێداپۆشی بە واتایەکی تر یەکەمجار کە خەڵك دواکەوتو بوو ڕووت بوو دوای کە پێشکەوتو خانو و بینای دروست کرد خۆی داپۆشی کەواتە خۆ داپۆشین نیشانەی پێشکەوتن و شارستانیەتە بۆ یە لەمێژوی زێڕینی ئیسلام دا موسڵمانان هەڵگری ئالای پێشکەوتن و شارستانیەت بوون ئەمەش وای کردووە دوژمنانی ئیسلام لە هەموو لایەکەوە بکەونە ڕوخاندنی قەڵای ئیسلام و لە هەمو

لایەکەوە بەدوای کون و کەلەبەرێك دا بگەڕێن و تا دەرگایەك پەنجەرەیەك بدۆزنەوەو خۆیان بکەن بەناو ئەو قەڵایەداو لەناوی بەرن لە ڕاستیدا نهێنی ئەم کارەیان دۆزیەوەو زانیان ئەم چونە ژورەوەیان لەدەرگا دەلاقەی ئافرەتەوە زۆر کاریگەرو ئاسانە بەڵگەشمان بۆ ئەو ڕاستی ئەو قسەیەی (گلاجستۆن)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیایە کە لە کۆنفرانسێکی گەورەدا وتی: ( هەتاوەك و ئەو قورئانە لەدەستی موسڵماناندا بێت ئەوروپا ناتوانێت بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا زاڵبێت و بەڕێ بوومی خۆیان بۆ خۆیان بخۆن یەکێك لە ئەندامانی کۆنفرانسەکە گاورێك بوو هەستا قورئانێکی دڕی وتی ئێمە بەم شێوەیە دەتوانین قورئان نەهێڵین (گلاجستۆن) وتی: ئەزانی خراپترین ڕێگا کە ئێمە بیگرینە بەر ئەوەیە بە ئاشکرا قورئان بدڕێنین چونکە ڕقی موسڵمانان زیاتر دەکات وتیان ئەی چی بکەین؟ وتی پێویستە نەخشەیەکی ورد و دوور مەودا دابنێین بۆ ئەوەی موسڵمانەکان کار بەو قورئانە نەکەن یەکەم هەنگاویشمان بۆ ئەو کارە دەبێت لەناوبردنی حیجاب و پۆشاکی شەرعی موسڵمانان بێت (گلاجستۆن) درێژەی بە قسەکانی داو وتی : ئێمە ناتوانین دەست بەسەر هەموو بوارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابورییەکانی وڵاتانی ئیسلامیی دا بگرین هەتاوەکو پۆشاکی شەرعی لەبەری ئافرەتی موسڵمان نەکەینەوە بەڕاستی ئەم پلانە ژەهراویە ی گلادستۆن یەکەم پلان و دوایەمین پلانیش نابێت کە

لە دژی موسڵمانان و ئیسلام داڕێژرابێت. هەروەك و( ئانا مليجان) دەڵێ ( هیچ ڕێگایەكی ئاسان ترو كروت تر نیە لەبەردەم ئەوروپادا باشتربێ بۆڕوخاندنی كۆمەڵگەی ئیسلامی لە ڕوت كردنەوەی ئافرەتی موسڵمان هەروەها (مورو بیجەر)كە جولەكەیەكی ئەمریكیە لە كتێبەكەی خۆیدا (العالم العربي اليوم) دەڵێ : نزیك ترین ڕیگا كە ئێمەی جولەكەی جیهان بیگرینە بەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی قەڵای ئیسلام ڕوت كردنەوەی ئافرەتی موسڵمانە! دیارە ئەم نەخشە ژەهراویانە مێژویەكی دوورو درێژیان هەیەو لە سەردەمی پێغەمبەرەوە بەردەوامە، لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم ) ئافرەتێك لە بازاڕی شاری مەدینە ئاڵتون و پێویستی خۆی دەكڕی ئالەو كاتەیا جوڵەكەیەك پەلاماری دا ویستی جبەكەی لە بەرا داكەنێ و ڕووتی بكاتەوە چونكە جولەكە بەدرێژای مێژوو ئاواتیان ئەوە بووە ئافرەت ڕووت بكەنەوە، ئافرەتەكە قیژاندی و هاواری كرد صحابەیەك پەلاماری جولەكەكەیی داو كوشتی، جولە كەكانیش هاتن صحابەكەیان كوشتەوە، لەو كاتەوە جولەكەكان هەزاران نەخشەیان بەكارهێناوە بۆ ڕووت كردنەوەی ئافرەتی ئیماندار ، هەروەكو یەكێ لە مستەشرقەكان دەڵێ ( لايصلح حال الشرق لنا إلاَّ بعدَ أن تنزع حجاب المسلمات تخطية القرآن ) ئێمە ناتوانین دەست بەسەر حاڵی سیاسی و كۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئابوری شەرقی ئەوسەتا بگرین هەتا لەچكی سەر ئافرەت لێنەكەینەوە و

لە قورئانەکەیەوە نەئاڵێنین، بەداخەوە ئێستە ئێمەواین ئافرەتەکە منـاڵی دەبــێ قورئانەکــەیان هێنــاوە بــە پارچـەیەك پــەرۆ پێـچاویانەتەوە لـە پـشتی سـەریەوە دایـان نـاوەو نـابێ کـەس بیکاتــەوە. ( لویــسی نۆیــەم) هەشــتەیەمین ســەرکردەی خــاچ پەرسـتەکان لـە شـەڕێکا لەلایـەن موسـڵمانەکانەوە بـەدیل گیراو دواتر لە ئەسکەندەریەی میصر ئازاد کرا، کاتێك کە گەیشتەوە ئەوروپا وتـی: وەڵاهـی گـەورەترین شـتێك کـەمن لـەم گیرانـەم دا فێری بووم ئەوەیە ئێمە ناتوانین بەسـەر موسڵمانەکان دا زاڵ بین و خێـرو بێریـان بـۆ خۆمـان بـەرین تـاوەکو ئافرەتـەکانیان ڕووت نەکەینەوە، ئەگینا بەکار هێنانی ئاگرو ئاسن هیچ سـودێکی نیە، وەپێویـستە هــەموو ولاتــانی ئــەوروپا و ئــەمریکا سیاســەتی عەسکەری خۆیان بگۆڕن بۆ ڕووت کردنەوەی ئافرەتی موسڵمان.

چـونکە ئـافرەتێکی ڕووتـی بـێ شـەرم لـە سـەد ڕاجیمـە و تـۆپ و تەیارە کاریگەری زۆرترە، هـەروەها جارێکی تر ئەوروپیەکان لە کۆبونەوەیەك دا کە لە وولاتی سوید کرا وتیان ئەبێت ئاواو ئاوا ئیسلام لەناوبەرین ئالەو کاتەدا مستشریقێکی گاورەکان هەستاو وتی: (كأس غانيةُ تفعلات بتحطيم أمةُ محمدية مالا تفعلوا مدافعُ و سواريخ ) پەرداخێك عەرەق و ئافرەتێکی ڕووت لە دەیان تۆپ و ساروخ باشترە بۆ ڕووخانی قەڵای ئیسلام.

وتــی: بەســاروخ و تۆمــاهۆك و فڕۆکــەی بــی پــەنجاو دوو لــە موســڵمانەکان دەی بەقــەد ئــافرەتێکی ڕووتــی لــەش فــرۆش

کلوێکەری نیە لەسەر دیین و دڵی موسڵمانەکان بۆیە بەناوی جۆراو جۆرەوە بەناوی ئازادی و پێشکەوتنەوە، ڕۆژبەڕۆژ هەرساڵەی بەشێوەیەك چەند سانتی مەتریك لەبەکەی کورت دەکەنەوە، تا تەنورەکەی ئەبەنە سەرئەژنۆیەوە. (گریستن ئاندرسن) چیرۆکێکی زۆر جوانمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت دوو خەیاتی دەست بڕ و فێڵباز لەگەڵ ڕێزما بۆهەمو بەرگ درووەکان کەپیشەی بەرگ درووی هەیەو پیشەیەکی بەڕێزە. ئەم دوو بەرگ درووە دەچنە شارێکەوە سەیریان کرد پاشای ئەو شارە زۆر ساویلکە بوو هەموو هیوایەکی ئەوەیە شتێکی هەبێت و خەڵك نەیبێت، ڕۆژێ دوو بەرگ دروەکە چونە لای پاشاو ووتیان ئێمە بەرگ درویەکی بەناو بانگی جیهانین و باشترین جل و بەرگ ئەدورین، هاتوینەتە خزمەتی جەنابت حەز ئەکەین جل و بەرگێکی جوانت بۆ بدورین، کەتا ئێستا کەس لەبەری نەکردبێت، زۆرباشە بەلأم ئەو جل و بەرگەی ئێوە ئەی دوورن چیەو چۆنە ووتیان قوربان قوماشەکەی زیووە تاڵەکانی بە دەزووی ئالتونی ئەدورێت بەلأم هەرکەسێك حەلأل زادە نەبێت نای بینێت بە واتایەکی تر بەس ئەوەی حەرام زادەبێت دەی بینێت، پاشا وتی: بە چەند تەواو دەبێت، ووتیان: بەوەندە کیلۆ ئالتون تەواو دەبێت. پاشا وتی: جا ئەوە چیە! سەد کیلۆ ئالتونیان بدەنێ، دووکانێکی گەورەشیان بۆ بکەنەوەو هەموو شتێکیان بخەنە بەردەست، ئەوانیش مەعمەلێکی گەورەیان بۆ

کردنەوە کاتێك کە چونە ناو مەعمەلەکەوە زۆر لێزانانـە دەستیان دەجـولآن و خۆیـان خـەریك دەرکـرد بەشـێوەیەکی وا هەرکەسـێ نەیزانیایە دەیوت: بەخوا ئەم بەرگ دروانە ئازان شـەو و ڕۆژیان خستۆتە سەریەك بۆ ئەوەی جلەکانی پاشا تەواو کەن، پاش چەند ڕۆژێك پاشا سەرۆك وەزیرو بەردەستەکانی نارد ووتی: بچن بزانن جلەکانم زۆری ماوە، کاتێك کە سەرۆك وەزیران چوونە نـاو کارگەکـەوە هیـچیان نـەبینی بـەس بینـی بـەرگ دروەکـان دەستیان دەجولآن بەلآم سەرۆك وەزیران لـە ترسی ئەوەی پێی نـەڵێن حـەرام زادەیـە، کاتێـك کـە گەڕایـەوە وتـی: جەنابی پاشا جلەکانت زۆری نەماوە، هـەر شـایانی ئەوەیـە جـەنابتان لەبـەری کـەن. پاش ئەوەی پاشا چـەند کەسـی تـری نـارد بـۆ سـەیری جلـەکانی ئەوانیش کـە چوون هیـچیان نەبینی بـەلآم لـە ترسـی ئەوەی پێیان نەڵێن حەرام زادەن گەڕانەوە وتیـان: جەنابی پاشا جلی وا کەس نەیبینیوە و هەر شیرینە سەیر کەی و والە تەواو بوونایـە، دوای چـەند ڕۆژێـك بـەرگ دروەکـان ناردیـان بـە دوای پاشایاو ووتیان وەرە قوربان جلەکانت تەواو بووە، پاشاکە هات لە ڕاستیدا هیچی نەبینی ووتیان ئەوە شەڕواڵەکەیەتی و ئەوەش عەباکەیـەتی و ئەوەش چاکەتەکەیەتی و ئـەوەش تاجەکەیـەتی، پاشا لە دڵی خۆیدا وتی: بەخوا وا دیارە ئەوان هـەمووی حەلآڵ زادەن بۆیە دەیبینن بەس بەخوا لەوانەیە من حـەرام زادە بم بۆیە نـای بیـنم، ئەوەنـدەم مـاڵی ئـەو میلەتـە خـواردووە و ئەوەنـدەم

زووڵم لە خەڵك كردووە بۆیە نایبینم جالەبەر ئەوە خەڵك پێی نەڵێن پاشا حەرام زادەیە هیچی نەوتو ووتی دەستان خۆش بێت بۆ ئەم جلانەی دوریوتانە وتیان فەرموو ئێستە لە ژورێكا لەبەریكە، پاشا چووە ژورەكە خۆی گۆڕی و هاتە دەروەو وتیان با جلەكانی پاشا پیس نەبێت لە دواوە عەباكەی بۆ هەڵگرن دوو پیاویش چەمانەوەو بە حیسابی خۆیان عەبای پاشایان هەڵگرتووە هیچیشیان بەدەستەوە نیە پاشاش بە ڕووت و قوتی بەناو خەڵكەكەدا دەڕۆیشت كەسیش نەیدەوێرا بڵێ خۆ پاشا ڕووت و قووتە چونكە دەیان ووت ئەوانە حەرام زادەن بۆیە نایبینن، بەكوردی پاشایان بەڕووت و قوتی بەناو خەڵكا دەسوڕانەوە و دەیان ووت: ماشاالله لەو جلە جوانانەی لەبەریایەتی ، لەوكاتەیا لە ناو ئاپۆڕای جەماوەرەكەیا منالێكی بچوكی دەرون پاك بەباوەشی دایكیەوە بوو هاواری كرد كوڕە خۆپاشا ڕووتە، دایكەكەش دەمی منالەكەی گرت و ووتی: ووس بە نەوەكو ڕۆڵە گیان پێمان بڵێن: ئەو منالە حەرام زادەیە و دایكی زینای كردووە. هەموو خەڵك دەیان زانی پاشا ڕووتەو هیچی لەبەرانیە بەلاّم نەیان دەوێرا لەترسی ئەوەی پێیان نەڵێن ئەوان حەرام زادەن. وەلاّهی زۆر ڕاستە ئەم ڕۆش بەناوی ترسی ئەوەی خەڵك نەڵێن دواكەوتووە و شێت بووە، ئەو هەموو ئافرەتە موسڵمانە دكتۆریشە مامۆستاشە ئەندازیاریشە ڕووت كراوەتەوەو كەسیش ناوێرێت قسە بكات نەوەكو پێی بڵێن

دواکەوتووە، سیاسەتیی ئەمڕۆی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دونیاش هەر وایە ئەی نابینی هەر ساڵەی بەناوی مۆدێلاتێکەوە چەند سانتی مەترێك کورتی دەکەنەوە کەسیش ناوێرێ قسە بکات. واتە: دوژمنانی ئیسلام بۆ سەرکەوتنی پلانەکەیان کەوتنە هەڵرشتنی فرمێسکی تیمساحیان، بۆ ئافرەتی موسڵمانان و وتیان: ئافرەتی موسڵمان کۆت و زنجیر کراوە و لەناو عەبایەکی ڕەش خراوە وەك و ژورە تاریکەکانی بەندی خانە ڕەشپۆش کراوە و هەمو جۆرە ماف و ئازادیەکی لێزەوت کراوە، بەم شێوەیە ووردە وردە ئافرەتی موسڵمانیان لەناو قەڵای بەرگ و شەرم و حەیا دەرهێناو ڕووتیان کردەوە، دواتریش بەناوی یەکسانی یەوە تێکەڵ بە پیاوی نامەحرەمیان کرد، ئەوەتە ( محمد طالب حرب ) لەبارەی ئەوروپیەکانەوە دەڵێ: هەر لەدێرزەمانەوە ڕوت کردنەوەی ئافرەتی موسڵمان و تێکەڵ کردنی بە پیاوی نامەحرەم بەناوی یەکسانی یەوە یەکێك بووە لە هیواو ئاواتە هەرە گەورەکانی ئەوروپیەکان بۆ مەبەستی گەیشتن بەهیواو ئاواتەکانی خۆیان، بەتایبەتیش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و ڕوخاندنی خەلافەتی عسمانیەوە ئەوروپاو ئەمریکا توانیان لە ڕێگای حەلقە لە گوێکانیانەوە دەستیان کرد بە داڕشتنی کۆمەڵێك یاسا تا وەکو لە ڕێگای یاساو قانوونەوە ڕێگری بکەن لەپۆشاکی ئیسلامی بۆ نموونە (کمال ئەتا تورك)ی بەڕەگەز جولەکە کاتێ دەوڵەتی عەلمانی تورکی دامەزراند

چەندین یاسای دانا لەدژی ئافرەتی بالاَ پۆش، ئەمەش تارادەیەکی زۆر کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ڕووت کردنەوەی ئافرەتی موسڵمان بەتایبەتیش کاتێك کە ڕێیان نەدا هیچ ئافرەتێکی باڵا پۆشی محەجەبە لە زانکۆکان بخوێنێ، بۆ نموونە کچێکی بالاَ پۆش ئاخیر ساڵی خوێندنی دکتۆرای بوو ووتیان: یان ئەبێت لە چکەکەت فڕێبدەیت یان دەبێت واز لە خوێندنەکەت بێنی ووتی: وەلاَ لە چکەکەم فڕێنادەم تا شهاددکەم بەنێ ووتی: زۆر بە شانازیەوە واز لە شهادەی دکتۆراکەم دێنم، بۆ ئەوەی شەهادەی ( لاإلە إلاالله ) کەم نەدۆڕێنم. بە داخەوە زۆرن ئەوانەی شهادەی دکتۆرا بەدەست دێنن بەلاَم شهادەی ( لاإلە إلاالله ) دە دۆڕێنن، ئەو ئافرەتە بەگریان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، باوکی وتی: ڕۆڵە گیان بۆ دەگریت خۆ تۆ بکالۆریۆس و ماجستێرت هەیە، ووتی: باوکە گیان بۆ شهادەکەم ناگریم بۆ زەلیلی موسڵمانان دەگریم کە ئەم هەموو مشك پەرستو مار پەرستە هەیە و ڕێزیان لێ دەگیرێ بەلاَم موسڵمانان لە ولاَتی خەلافەتی ئیسلامیاو لە ماڵی خۆیا زەلیل دەکرێ! وەلاَ بۆ زەلیلی موسڵمانان دەگریم بۆ شهادەکەم ناگریم ، تەنانەت سزای ئەو کەسانەشیان داوە کە سەرپێچی ئەو قانوونە دەکەن، بەزەبری کوتەك و قامچی سەر پۆش و حیجابیان لەسەری ئافرەت کردۆتەوە بەڵام الحمد لله دوای نەوەد ساڵ لە حوکمی کەمالیەت لە تورکیا تازە بەتازە لە ناو بازاڕو

قوتابخانــەو زانكۆكــان و ناوەنــدەكانی تــری ژیــان دەتــوانیٚ مومارەسەی باڵا پۆشی بكات ئەویش لە دوای دەرچونی حیزبی داد و گەشە پیٚدانەوە ئافرەتی موسڵمان دەتوانیٚ بەلەچكەوە لە زانكۆكـان بخویٚنیٚت. ئەینا ئەوە ئیٚران لـە سەردەمی رەزاشـای ئەڵقە لەگویٚی ئینگلیزبە ئاشكرا دژایەتی حیجاب دەكرد لە ساڵی ١٩٦٢ بڕیـاری دا لـە سەرتاسـەری ئیٚرانـدا پۆشـاكی شـەرعی قەدەغـە بیٚـت، شـا ژنەكەی خۆشـی یەكـەمین ئافرەتیٚك بـوو كـە لەناو ئاهەنگیٚكی گەورەدا جلو بەرگە شەرعیەكەی فڕیٚداو ووتـی باوی نەماوە، دوایش وتیان هەركەسیٚ سەرپیٚچی ئەم بڕیارە بكا بەتونـدی سـزادەدریٚ، گـەلیٚك ئـافرەت كـە بـەیانیان بـە جلـی شەرعیەوە دەچونە دەرەوەئیٚواریٚ بە سفوری دەگەڕانەوە چونكە پـۆلیس بــە زۆر سەرپۆشــەكەی فــڕیٚ دەداو عەباكەشـیان لــیٚ دەسەند، هەروەها نەیان دەهیٚشت ئافرەت بە داپۆشراوی بچیٚتە قوتابخانــەو زانكۆكـانو پـەیمانگاكان. هـەروەها وڵاتـانی تــری ئیسلامیش حاڵیان لە توركیا و ئیٚران باشتر نەبوو وڵاتی جـەزائیر ئەو وڵاتەی یەك ملیۆن شەهیدی لە ڕیٚگای بیرو باوەڕی ئیسلامیا بــە خــشی تیٚكۆشــا دژی إســتعماری جیهــانی ســەرەنجامیش شۆڕشە ئیسلامیەكەی سەركەوت بەڵام بە داخـەوە خوانەناسـان و خۆفرۆشـان سـەر نخونیـان كـردەوە!، بۆنمونـە (أحمـد بـن بـیلا) كۆمـەڵیٚ یاسای زۆر تونـدی دانـا بـۆ فڕیٚدانی سـەرپۆشو جلو بــەرگی شــەرعی ووتــی جــاران فەرەنــسا داوای لــیٚ دەكــردین

ئافرەتـانی داپۆشـراو حیجابەکـەیان فڕێـدەن بـەڵام ئێـستا لـە پێنـاوی ئـازادی ئـافرەت مـن داوا لـە ئافرەتـانی جـەزایر دەکـەم حیجابەکەیان فڕێدەن. هەروەها ئەفغانستان لە سەردەمی (أحمد أمـان) هـەموو یاسـاو ڕێسا شـەرعییەکانی لـەو وڵاتـەیا گـۆڕی و یاسای عـەلمانی لـە شوێنیان دانـا تەنانـەت بـە مەبەستی ئـازاد کردنـی ئـافرەت بڕیـاری دا کـە دەبـێ ئافرەتـانی ئـەفغانی سـەرپۆش و حیجابەکـەیان فڕێـدەن، میـصر بـەحوکمی گرنگـی شـوێنە جـوگرافی یـە کـەی لـە کۆنـەوە هـەوڵیان داوە ئـافرەتی موسـڵمان لەبـەرگو پۆشـاکی شـەرعیدا دەر بێـنن، وەیەکـەم وڵاتـی ئیسلامی بوو کە یانەی دژی ئیسلامی کردەوە ( جیهـان سادات) بە ئاشکرا دەی ووت ئافرەتی محەجەبە مناڵە کانمان دە ترسێنن و حیجـاب لەگـەڵ پێش کـەوتنی جیهانـدا نـاگونجێ. بـۆ یـە بـەو پـەڕی ئـوت بەرزیـەوە دەی ووت مـن وەك مامۆسـتایەکی زانکـۆ هەرکچێ بە حیجابەوە بێتە دەرسەکەمەوە دەیکەمە دەرەوە نایەڵم تـا سەری ساڵ بێتـە دەرسـەکەمەوە. هـەروەها سەدان ئـافرەتی داوێـن پاکیـان لـە زینـدان تونـد دەکـرد بـەس لـە سـەر ئـەوەی داپۆشراو بوون بۆ نمونە (زەینەب غەزالی) ئافرەتێکی محەجەبەی میصری بوو ساڵی ١٩٩٥ دا کۆچی دوایـی کـرد لـە شەستەکاندا ئافرەتـانی فێـری قورئـان خوێنـدن و بـاڵا پۆشـی دەکـرد، بەڵام بە داخەوە لە لایەن جەلادەکانی جمال عبدالالناصری گۆڕبە گـۆڕەوە گـیراو خرایـە زینـدانـەوە، بـۆ خـۆی بۆمـان دەگێرێتـەوەو دەڵێـت

ئـازارو ئەشـکەنجەیەکی زۆر یـان دام تـاوەكو لـە بـالاّ پۆشـیەکەم پەشـیمان بمـەوە، بـەلاّم بـەو پـەڕی جورئەتـەوە پـێم وتـن ئـەم سەرپۆشە فەرزی خوایـە ئایـەتی خوایە ئایـەتی قورئانـە بە هـیچ جۆرێك فرێی نادەم ئەڵێ کە زانیان پۆشاکەکەم فرێ نادەم ڕۆژێك دوو جەلادی زۆر بەهێز بۆم هاتنە دەرەوە وە بۆ ئەوەی کە ئیشی داوێن پیسیم لە گەڵدا بکەن، دوایش لـە سـەر ڕوپـەڕی ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان بـلاّوی بکەنـەوە و بڵـێن ئەوەتـە ئافرەتـە داپۆشـراوەکە زینای کـردووە، ئـەڵێ منـیش زۆر گریـام هـیچ دەسـەلاّتێکم نـەماو ڕووم لــەخوای خــۆم کــردوو بەچــاوی پڕفرمێـسکەوە هــەردوو دەستەکانم بەرزکردەوەو وتم خوایە خۆت ئاگاداریت بە پـەنهانی ناو دڵەکان کەمن لە سەر دینەکەی تـۆ ئەیانـەوێت دەسـت درێـژیم بکەنە سەر خوایە یارمـەتیم بدەیتو ڕزگـارم کـەی ئـەڵێت یـەکیان لـێم نزیـك بـۆوە بـۆ ئـەوەی دەسـت درێـژیم بکاتـە سـەر وەلاّهـی قەپێکم بە شادەماری ملیا کـرد پچڕاندم توشـی نـەزیف بـوو هـەر لەویا مرد، جەلادەکەی تریشیان کەئەوەی بینـی ترسـاو ڕایکـردە دەرەوە ئـەڵێ لـە دوای ئـە وەشـەوە خـوای گـەورە عیزەتێکـی وای دابومێ یەك جەلاد نەی دەوێـرا لـێم نزیـك بکەوێتـەوە، زۆر ڕاسـتە خـوای پـەروەردگار سـام و هەیبـەتێکی زۆری داوە بـە ئـافرەتی موسڵمان و ناوی ناوە قەلاّ ئەگـەر خـۆی سـوکی نـەکا بە هـەزاران پیـاوی ئـازاو بـە جـەرگ نـاگیرێ هەربۆیـە لـە کوردەواریـدا باسـی ئافرەتی بەحەیا کراوە ووتویانە ئافرەت قەلاّیەکی سـەختەو وا بە

ئاسـانی نـاگیریّ، زەینـەب غـەزالی دەڵـیّ: هـەر ئەوەنـدە کـە جەلادەکان زانیان خۆم نادەم بە دەستەوە ووتیان با لە برسان بیکوژین و نان و خواردنی مەدەنیّ، ماوەی هەفتەیەك هیچیان نەدامیّ زۆر بێهێزوو لاوازبووم تاشەوێکیان بەخزمەتی حەزرەتی پێغەمبەرو حەزرەتی ئەبوبەکر و عمر کۆمەڵیّ لە صحابە گەیشتم ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە سەر دینی خوا ئەیانەویّ دەست درێژی بکەنە سەرم و بە برسێتی بمکوژن تخوا شتێکم بەریّ زۆرم برسی یە ئەڵیّ لە خەوەکەمدا پێغەمبەر شتێکی دامیّ و فەرمووی بیخۆ ئەوە بەشت دەکات و خەمت نەبێت، ئـەڵیّ کـە خـواردم برسـێتیەکەم نـەما، وەلأهـی هەرجارێکیش بە برسێتی تەعزیبان دەدام لەخەودا بە خزمەتی پێغەمبەر دەگەیشتم ئەو شتەی دەدامیّ و برسێتیەکەم نەدەما، زۆر ڕاستە هەر ئافرەتێکی ئیماندار لە بەر ڕەزامەندی خوا خۆی داپۆشیّ خوای گەورە یارمەتی دەدات و سەر بەرزی دونیاو قیامەتی دەکات.

خۆشەویستان هەروەها ڕژێمی عێراق بوو کاتیّ خۆی داوای لەئافرەتانی موسڵمان دەکرد چ لە بازاڕوو چ لە قوتابخانەو چ لە زانکۆو دام و دەزگا ڕەسمی و ناڕەسمیەکان جل و بەرگە شەرعیەکەیان فڕیّ دەن و خۆیان ڕووت کەنەوە لەوەش زیاتر خۆ ڕووت کردنەوەیان بە پێش کەوتن دەزانی و لەوەش خراپ تر ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان ڕووت نەدەکردەوە و سوراو سپاو

میکیاجیـان نـەدەکرد بـە نـەزانو دواکـەوتویان دەزانـی، هـەر بەمەشەوە نەوەستان لە ڕیگای وەزارەتی پەروەدەوە بڕیاریاندا، کـەنابێ ئـافرەتی داپۆشـراو لەناوەنـدی حکومەیەکانـدا دا بەزرێنـدرێت گوایـە حیجـاب لەگـەڵ ڕەوڕەوەی پێـشکەوتن دا نـاگونجێ، خوێنـەرانی بـەڕێز ئێـستە بـا بێینـە سـەر باسـی کوردستانی خۆمان،بە داخەوە کە دێنە سەر باسی کوردستانی خۆشمان حاڵمان گەلێك لەو وڵاتانە خراپترە، بە تایبەتی شاری سلێمانی کە هێشتا شەریکە مۆنۆ پۆڵە ئەوروپی و ئەمریکی یـەکان نەخـشەکەیان نەکێـشاوە مۆدێلەکـەی لـە کوردسـتان لەبـەرکراوە لـە سـەر شـەقامەکان ئـافرەتی ئێمـە خـۆی پێـوە ڕادەوەشێنێ و پۆزی پێوە لێدەدات، لەوەش زیاتر دەزگاکانی ڕاگەیانـدن، بـە نـاوی ڕیکـلام و نوێخوازیـەوە کـارێکی وایـان کـردووە، کە ئافرەتی داماو فریای ئەو هەموو مۆدێلە ناکەوێ لەبەریان بکات تا مۆدێلێکیان لەبەردەکات ئەوەی تریان باوی نەماوە مۆدێلێکی تازە هاتۆتە بازاڕە کانەوە، زۆر بەداخیشەوە موسـڵمانانیش بـە شـێوەیەکی گـشتی بـە پـیرو گەنجـەوە بەخوێندەوارو نەخوێندەوارەوە بە هەژارو دەوڵە مەندەوە بە دەم بانگـەوازی چەواشـە کارانـەی کەناڵـەکانی ڕاگەیانـدن کـەوتوون، کەخۆشـیان ڕووت دەکەنـەوە بەمەبەسـتی ئـەوە یـە کـە خۆیـان خۆشەویست بکەن بەڵام ئافرەتان بەڕووتو قوتی خۆشەویست نـابن لـە دڵـی پیاوانـدا بـەڵکو بـە خۆداپۆشینو ڕەوشـتی بـەرز

خۆشەویست دەبن هەروەکو خوا لە ئایەتی بیست و شەشی سورەتی " اعراف " دا داوا لە ژن و پیاوی ئیمان دار دەکات کە خۆیان داپۆشن چونکە جل و بەرگ نیشانەی ڕێزو حورمەتەوفرێی ئەدەن (يَا بَنِي آدَمَ لا يَفْتِنَنَّكُمْ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنْ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ ) دەفەرموێ ئەی نەوەکانی بەنی ئادەم جل و بەرگمان بۆ ئێوە ناردووە تاوەکو لاشەو داوێنی خۆتانی پێداپۆشن و خۆتانی پێڕێزدار و سەنگین کەن، هەروەها لە ئایەتی بست و حەوتی هەمان سورەت دا دەفەرموێ (( وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ )) ئەی مۆرقە کان وریا بن زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت شەیتان فریوتان نەداو ئاشوب نەخاتە بەیناتانەوە هەروەکو چۆن دایك و باوکە ئادەم و حەوای لە بەهەشتەوە دەرنا جل و بەرگ و پۆشاکی لێ داماڵین کە داوێنی خۆیان پێداپۆشی بوو، ئیماندارانی بەڕێز لەم ئایەتانەدا خوا داوا لە هەموو باوەڕداران دەکات کە خۆیان داپۆشن و دور بکەونەوە لە سفوری و ڕووت و قوتی دوای نەخشەی خوانەناسان نەکەون، بەداخەوە گەلێك ڕۆشنبیرو ئەدیب و نوسەرو هونەرمەند بە قەڵەم و شعرەکانیان کەوتنە لۆمەو

سەرزەنــشت کردنــی ئــەو ئافرەتانــەی کــە پۆشــاکی شــەرعیان لەبەردایــەو جارێــك بــە دوا کــەوتو و کۆنــە پەرستیان لــە قەڵــەم دەدەن و جارێکیش بەوەی کە نەخۆشی سیلی پێوەیە و جارێکی تریش بەوەی کە دەیان ووت: جل و بەرگی عەرەبی و دوژمنانە، هەورەکو مامۆستای هونەری ناوداری کورد (بێکەس) دەڵێ:

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە

گیرۆدەی بەندی ، ژیانت زوڵمە

هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە

سەرپۆش فرێ دە چ وادەی شەرمە

******

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە

عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانە

فەرقی نێر و مێ نیە بیزانە

هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرکە

سەرپۆش فرێدە چ وادەی شەرمە

******

هێندە دانیشتی پشتت چەماوە

زەردوو لاواز بویت هێزت نەماوە

کچی بێگانەت خۆ لە بەرچاوە

هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە

سەرپۆش فرێدە کەی وادەی شەرمە

لەم شعرەدا شاعیر بەئاشکرا دەری دەخا کە دەمێکە داخی لەدڵە بۆ نەسرین، چونکە خۆی داپۆشیوەو پۆشاکی شەرعی و سەربەرزی لەبەرایەو سەرو ژێری نابینێ، بۆیە داوای لێدەکات پۆشاکو سەرپۆشەکەی فڕێبدات و بێتە مەیدان و تێکەڵی پیاوان بێت و داوای لێدەکات کە فێری زانست و زانیاری بێت و دەڵێ: جیاوازی لە بەینی نێر و مێ دا نیە، شاعیری بەڕێز وا دەزانێ ئەو پۆشاکە شەرعیە ڕێی لەئافرەتی مسوڵمان گرتووە، کە نابێت فێری زانستو زانیاری بێت، زۆر بەداخەوە هونەرمەندی بەڕێز بە پێچەوانەوە لە دینی خوا تێگەیشتووە، وا دیارە هیچ خوێندنەوە و متالەعەیەکی سەرەتایشی نیە بۆ زانستە شەرعی و دینیەکان و بێ ئاگایە لەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (من سلك طريقا يبتغي فيه علماً سهَّل الله له طريقاً إلي الجنة، ز إن الملائكةَ لَتضعُ أجنحتها لطالِب العلم رضاً بِما يصنع، وأن عالِم ليَستغفرُ له من في السموات و من في الأرض حتيَّ الحيتانُ في الماء و حصلُ العالم على العابد كفضل القَمرِ على سائر الكوكبِ، و إن العلماءَ و رثةُ الأنبياء إنَّ الأنبياءَ لم يُورثوا ديناراً و لادرهماً و إنما يُورثوا العلمَ، فَمَن اَخَذَهُ اَخَذْ بحظء وافر)) [٤٢]رواه ابوداود(١٣٨٨)صحيح:رواه ابوداود(٣/٣١٧) ژمارە (٣٦٤١)(٣٦٤٢)، الترمزي (٥/٤٨)ژمارە (٢٦٨٢) دەفەرموێ هەرکەسێ ژن بێ یان پیاو بچوك بێ یان گەورە بە دوای فێربوونی زانستو زانیاریدا بگەڕێ بۆ ئەوەی خزمەتی دین و میلەتی پێبکات، فریشتەکانی خوا باڵی ڕەحمەتی بۆ ڕادەخەن بۆ ئەوەی ئەو کەسە موسڵمانەی بەسەرا بڕوات، هەموومان بیستومانە کاتێك کە سەرۆك

---

[٤٢] رواه ابوداود ١٣٨٨ صحيح:رواه اوداود ٣/٣١٧ ژمارە ٣٦٤٢،٣٦٤١،ترمذی ٥/٤٨ ژمارە ٢٦٨٢

کۆمارەکان یان رەئیس وزەرای ولأتێ دەچن بۆ ولأتێکی تر ئەگەر رێـزی زۆری لێبگـرن فەرشـی سـوری بـۆ ڕادەخـەن، کاتێـك کـە لـە تەیارەکە دابەزی فەرشی سوری بۆ ڕاخراوەو حیمایەش ئەم لاو لای دەگـرن، کـە ئـەوە نیـشانەی ئەوەیـە رێـزی زۆری لـێگیراوە، ولأهـی هەرکەسێ ژن بێ یـان پیـاو کاتێك کـە خـەریکی فێربـوونی زانـستو زانیاری دەبێت، جا علمو زانیاری شـەرعی ئیسلامی بێـت یـان علمو زانیاری دونیـایی بێـت واتـە: کەسێ دەیـەوێت ببێـت بـە دکتۆرێك ئـە نـدازیارێك مامۆسـتایەك داد وەرێـك......هتـد. ئـەو فریـشتانە بـاڵی خۆیـانی بـۆ ڕادەخـەن. هــەروەها چــەندین فــەرمودەی قورئــانو حەدیـسمان لـەو بارەیـەوە هەیـە کـە دەفـەرموێ: ئـەو کەسـەی کـە خـەریکی فێربوونی عیلم و زانیـاری یە هـەموو زینـدەوەرەکانی سـەر زەوی بە وشکانی و تەڕاییەوە هەتا ماسی ناو دەریاکانو مێروی نـاو کونەکان دوعای خێری بۆ دەکەن، چونکە ئینسانی زانـا زەرەری بـۆ کـەس نیـە ئـازاری مێرویـەکیش نـادا، وەلأهـی هـیچ بەرنامەیـەك رێـز حورمەتی مرۆڤی وانـە گرتـووە. هەروەها (شـێخ نـوری شـێخ صـاڵح) دەڵێـت: ئـافرەت نیـوەی کۆمەڵـە کـە چـی بـە داخـەوە بـەهۆی زوڵـمو ستەمی کۆنـە پەرسـتانەوە ئـەم نیـوەی کۆمەڵـە لەخوێنـدنو کـارکردن بێبـەش کـراون، ئـەوەتا دەڵـێ: (( زوڵمـی ئـەم مەلعونـە بـوو حـوکمی مساواتی نەهێشت)) واتە: بە ئاشکرا پۆشاکی ئیسلامی بە(ملعون) ناو دەبات، کە بێگومان خـوا ئـەم پۆشاکەی دانـاوەو لەسورەتی نـورا لەسـەر ئافرەتـانی فـەرز کـردووە، وادیـارە ئـەو یـش بـە فـەرمانی خـوا ڕازی نیە بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیەمان ئەم چەند دێڕە لـە شـیعرەکەی دەڵێت؟!

گوێم لە ناڵینی کچێ بوو دوێنێ ئەیلاوانەوە

وا بە تەئسیرو بەسۆز ئەیووت دڵی ئەتەزانەوە

ئەیووت ئەم ڕوو پۆشە تەنها ڕوی نەپۆشیوین و بەس

ڕوو بەڕووی خۆمان حقوقی ئاینە ناو ئنسانەوە

ئەوەڵۆ ئاخر خەتای ئەم ڕوو ڕەشەی ڕوو پۆشەبوو

بو بە مانیعمان بچینە کۆڕی پیاوانەوە

قەت نەیووت ڕۆژێ بە سەر بەستی حەقیی داوا بکەین

بۆ حقوقــی و حەقی خۆمان بێینە ناو مەیدانەوە

دایگرن توخوا فرێیدەن بیخەنە ناو تەندورەوە

حەیفە ڕۆژی ڕوون ئەنێنە ناو شەوی دەیجورەوە

زوڵمی ئەم مەلعونەبوو حوکمی مساواتی نەهێشت

جنسی ئێمەی خستە حاڵێکی لە پیاو پاڕانەوە

بۆ بەشی ئێمە کفن بێ هەر لە دونیاو ئاخرەت

لێرە ڕەش لەو لا سپی ببڕێ بە باڵآمانەوە

حەز ئەکەی بپرسە لە پیرانو پێشینانی خۆت

کێ پە چەی دیوە بەڕووی خاتونی کوردستانەوە

کەی پەچە بۆتە سەبەب بۆ عیفەتی جنسی لە تیف

کافر دڵ تیرە دەخلی کوا بەسەر ئیمانەوە

دایگرن، بیگرنە ناو خۆتان و دەوری لێبدەن

بەڵك و ببینم بە چاوی خۆم بەڕوح کێشانەوە

دایگرن تو خوا فرێدەن بیخە ناو تەندوورەوە

حەیفە ڕۆژ ی ڕوون ئەینێنە ناو شەویی دەیجورەوە[٤٣]

[٤٣] جەلالی، مصلح، دیوانی شێخ نوری شێخ صالح،بەغداد ؟؟؟

بـــە داحـــەوە ڕۆشـــنبیرو شـــاعیرو هونەرمەنـــدی بـــەناو مـــۆدێرن ئەوەندەیان ڕق لـە پۆشـاكو سەرپۆشـی ئیسلامی دەبێتـەوە، لـە دڵیاندا بۆتـە چیای قەندیلو پیرە مـەگرون، بۆتـە دوژمنـی بـاوە كوشـتەیان حەزدەكـەن ڕوحـی بەبـەرا بكـەن ، پاشـان بـە خەنجـەر پارچــە پارچــەی كــەن و دواتــر گــازی ژەهــراوی پیابكــەن‌و بیــسوتێنن‌و پاشــان تەرمەكەشــی بــە چــەپڵە ڕێــزان‌و گــۆرانی ووتنەوە بیبەن لە شوێنێكی چۆڵا بینێژن، تـاوەك‌و بـە حـەیاتی چاویان پێی نەكەوێتەوە، بەڵام بە دڵنیایەوە ئەو پۆشاكە فەرزی خوایە ڕۆژ بەڕۆژ دۆستان‌و عاشقانی لـە سەرتاسـەری جیهـان دا ڕوو لـە زیـاد بـوون دەكـەن (( مُوتُـوا بِغیـضكم )) ئـەبێ بـەو داخ و حەســرەتەوە بمــرن و بــچنە ژێــر ئــەو گڵــەوە، زۆریــشن ئــەو كەســانەی كــە بــەم داخــەوە ســەریان ناوەتــەوە لــە ڕاپــۆرتێكی وەزارەتی ناوخۆی فەڕەنسی دا هاتووە كە ڕۆژانە دەیان ئافرەتی فەڕەنـسی موسـڵمان دەبـن بـەو پـەڕی شـانازیەوە جل‌و بـەرگی شـەرعی لەبـەر دەكـەن (مـاری) كـچی پیـاوێكی كۆمۆنیـستە دوای تــەواو بــونی نوێــژی مزگــەوتی (لیــون) لەبــەردەم مامۆســتای مزگەوتەكەدا شـایەتومانی هێنـاو بـو بەموسـڵمان، مـاری دەڵێـت: ئێمە زۆرمـان ڕەخنـە لەئیسلام دەگرت لـەوەی كەگوایـە باڵپۆشـی دژی ئافرەتانە، بەڵام دوای بۆ مان دەركەوت كەوانیەو ئیسلام لـە هـەموو بەرنامـەو پرۆگرامـەكان زیـاتر ڕێـزی لـەئافرەت گرتـووە،

قورئـان بەتـەواوی جەختی کردۆتـە سـەر یەکسانی لـەنێوان ژن و پیاودا لەئەرك‌و ماف دا[٤٤] هەروەها بە پێی ڕاپرسیەکی ئەمریکی کە لە ساڵی ٢٠٠٩ دا کراوە دەڵێت: لـە سـەدا هەشـتای ئافرەتی ئـەمریکی حەزدەکـەن بگەڕێنـەوە بۆسـەر ڕەوشـتی بـەرزی بـالاْ پۆشـی و لـە سەدا شەسـتی ئافرەتـانیش حەزناکـەن کـچەکانیان حوریـەتی خـۆ ڕووت کردنـەوەی تـەواویان هـەبێت! بـەڵام ئـەی بۆچی زۆربەی ئافرەتی ئێمە حەزیان لە خۆڕووت کردنەوەیـە، بـە پشتیوانی خوا چەند خاڵێکی تریشتان بۆ باسدەکەم:

١- چاو لێکەری:

بەڕاستی یـەکێك لـە هۆکارەکانی ڕووت‌و قوتی لەوڵاتی خۆمانا چاو لێکـەری کوێرانەیـە، کـە بەداخـەوە ژیـان لـەوڵاتانی ئێمـەو زۆربـەی وڵاتـانی ئیـسلامی لەسـەر چـاو لێکـەری دەڕوات، زۆر خوشـکی بەڕێزمان هەیە کاتێ کە لە لادێوە چۆتە ناوشار، یەکسەر جل‌و بەرگە جوانەکـەی خـۆی فڕێـداوە، پانتۆڵێـك و سـترێجێکی تەسـکی لـەپێکردووە، کـە لێـی دەپرسـی خوشـکەکەم تـۆ هیـچت زیـادی نـەکردووە بـۆ خـۆت لێگـۆڕاوە دەڵێـت وەڵا مۆدیـەتی، چـونکە دوو ڕەفیقـی خـۆی بینـی خۆیـان ڕوت کردۆتـەوە ئـەمیش یەکسەر حیجابەکـەی فـڕێ دەدات لاسـای دەکاتـەوە یـان دەتـوانین بڵـێن: دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن کاریگـەری گـەورەیان هەیـە بەتایبـەتی فلیمـە دۆبلاژکراوە بیانیەکان.

---

[٤٤] بەرەو ئیسلام ئەندازیار عوسمان چاپی دووەم ٢٠٠٦.

## ٢- دەزگاكانی ڕاگەیاندن:

ڕاگەیاندن بەهەموو جۆرەكانی بینراو و بیستراوەوە ڕۆڵی گەورەیان هەیە لەسەر ئەوەی كە ئافرەتی موسڵمان داپۆشراو جل‌و بەرگەكەی خۆی فڕێداوە جل‌و بەرگی تەنك‌و تەسك و ڕوت لەبەر كات، جاری وا هەیە ڕاگەیاندن ڕەسمی ئافرەتی ڕووت‌و سفور بەجوان نیشانی خەڵك دەدات و ئافرەتی داپۆشراویش بە ناشرین نیشانی خەڵك دەدات، هەربۆیە جاری واهەیە ئافرەتێك هەڵەیەك دەكات بەس لەبەر ئەوەی محەجەبەیە گەورەی دەكەن و دەڵێن ئەمە ئافرەتە نوێژكەر و داپۆشراوەكەیە، تەنها بۆ ئەوەش جل و بەرگی شەرعی ناشرین كەن، تەلەفیزیۆن نیعمەتێكی گەورەیە ئەگەر مرۆڤ بە جوانی بە كاری بهێنێ، لە ئەمریكاو ئەوروپاو ولاتە پیش كەوتووەكان دا تەلەفیزۆنەكان باشترین بەرنامەی خۆیان سەر لەئێوارە پێشكەش دەكەن چونكە خەڵك هیلاك‌و ماندووە زوو دەخەوێت كەچی كەناڵە تەلەفیزۆنییەكانی ئێمە بەرنامەكانی خۆیان سەعات دەو یانزەی شەو پەخش دەكەن و زۆربەی بەرنامەكانیشیان بۆ ڕووت كردنەوەی ئافرەتان‌و تێكدانی بیرو باوەڕی گەنج‌و لاوەكانمانە، یان زۆربەی جار كە فلیممان بۆدەكەن ڕەسمی عەرەق خۆر و مەشروب خۆرەكە بەجوان و پێشكەوتوو وەصف دەكات، نوێژ كەر و حاجیەكەش بە ناشرین وێنا دەكەن.

### ٣- ترسان لەلۆمەی خەڵکی:

زۆربەی، خەڵکی ئێمە ئەمڕۆ بۆ خەڵك ئەژی دەتوانم بڵێم: ئەمڕۆ خەڵکی، بە ژن و پیاو بچوك و گەورەمانەوە بۆ خۆمان ناژین بۆ خەڵك دەژین ئەوەندی خەمی لۆمەی خەڵکیمانە ئەوەندە لە خوا بترساینایە بەسمان بوو، کابرا جل لەبەردەکات دەبێت بزانێ خەڵك کام جلەی بەلاوە جوانە ئافرەت جل لەبەردەکات دەبێت بزانێ کام جل ئەمڕۆ مۆدێلیەتی یەعنی ئەوەندەی خەمی ترسی خەڵکی یەتی خەمی خۆی نیە ئەوەش سەر لێشێواوی خەڵکە، مەبدەئێکمان نیە لەسەری بژین، ئەو بێ مەبدەئیەش ژیانی وێران کردووین هەموو ژیانمان بۆتە چاو لێکەری زۆربەی ئافرەتانی ئێمە لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا لەچك دەکات و قەناعەتی تەواوی پێیەتی بەلاَم لەدوای ڕەمەزان دای دەنێت لێ ی بپرسە بۆ چی خوشکەکەم دای دەنێیت و دەیخەیتە بۆفیەکەتەوە! دەڵێ: وەلاَ لەبەر تانە و تەشەری خەڵکی و بەخوا دوای پێم دەڵێن بووە بە ئیسلامی. ئەو تانەو تەشەرانە خەڵکی سارد دەکاتەوە بۆیە بەو پەڕی دڵ سۆزی یەوە بە خوشکانی ئیماندار دەڵێم ئەو ئافرەتەی لەبەر تانەو تەشەری خەڵکی لە چکەکەی فڕێ دەدات دڵنیابە ئەوە باش لە دینەکەی تێ نەگەیشتووە و با بزانێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: هەر کەسێك بیەوێت خواله خۆی توڕە کات بۆ ئەوەی خەڵکی لێی ڕازی بێت؟ سەرەنجام هەم خوای لێدە ڕەنجێ و هەم خەڵکیشی لێ ڕازی

نابێت، بەڵام هەرکەسێ خوا لە خۆی ڕازی کات و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات، سەرەنجام خوای لێڕازی دەبێت و خەڵکیشی لێ ڕازی دەبێت.

٤- لە هۆکارەکانی ڕووت و قوتی لە وولاتی خۆمان دا هەندێ لە ئافرەتان ئەوە ئەڵێت: من بۆیە سەرپۆش ناکەم چونکە لێم نایەت بەڵام لە ڕاستیدا هەروەکو چۆن دروست نیە بۆ هیچ کەسێ بڵی وەلا من نوێژم لێنایەت ڕۆژوم لێنایەت! بەهەمان شێوەش دروست نیە بڵێ بالاپۆشیم لێنایەت، چۆن نوێژو ڕۆژوو فەرزی خوایە حیجابیش فەرزی خوایە ((وما كان المؤمنٍ ولا مؤمنةٍ إذا قضى الله ورَسولُهُ أمراً أن یکون لە مغفرة)) خوا دەفەرموێت: مرۆڤ پیاو بێت یان ژن ئەگەر خواو پێغەمبەرکەی شتێکیان فەرموو بۆی نیە ئەملاو ئەولا بکات و بڵێ من بالا پۆشیم لێنایەت، ولاهی چۆن نوێژ بە ئایەتی قورئان فەرز کراوە چۆن ڕۆژوەکان بە ئایەتی قورئان فەرز کراوە ئاواش حیجاب بە ئایەتی قورئان فەرز کراوە.

٥- هۆکای پێنجەمی ڕوت و قوتی لەولاتی خۆمانا ئەوەیە کە هەندێکی تر لە ئافرەتان دەڵێن بۆیە من خۆم داناپۆشم چونکە ئافرەتێکی ڕوو خۆش و کراوەم، حەزناکەم ئەو جۆرە جل و بەرگە لەبەربکەم و خۆم ڕەق و تەق و وشك کەم وەڵا بالا پۆشی نیشانەی خەمۆکی و بێ تاقەتیە یەعنی تێکەڵی کەس نەبی و کەس تێکەڵت نەبێت و قسە لەگەڵ کەس نەکەی و کەس قسەت لە

گەڵ نەکات، نەخێر خوشکە بەڕێزەکەم ئەوە پێچەوانەی دینی ئیسلامە و ئەگەر ئافرەتێکیشت ئاوا بینیوە ئەوە خراپ لە دین گەیشتووە، بەڵام خوشکی ئازیزم تۆ هەوڵبدە نمونەیەکی جوانی ئافرەتی موسڵمان نیشانی خەڵك بدەیت! ئەگەر کەسێکیشتان دی وایە ئەوە سروشتی خۆی وایە یەو هیچ پەیوەندیەکی بە جل و بەرگ و حیجابەکەیەوە نیە، خەتای ئیسلام و قورئان نیە، ئەگەر شەوانە سەیری زنجیرە فلیمەکانی کەناڵی سەحەر بکەین، دەبینی شانۆکارانی بەشی سینەمای ئێران لەهەموو دونیا سەیری فلیمەکانیان دەکرێت بەڵکو جاری وا هەیە بۆ سەر زۆرێك لە زمانە بیانیەکان وەر دەگێڕێت، هەموشیان ئافرەتەکانیان جل و بەرگی شەرعیان لەبەردایەو لە بورای سینەماو کاری دۆبلاژ کردنیشا پلەی بالآیان لە دونیادا بەدەست هێناوە بۆ نمونە فلیمی (أصحاب الکهف) لە سەر شتێکی زۆر بچوك کە شیاوی باس کردن نیە نەیتوانی خەلاتی جیهانی وەرگریٚ، بگرە فلیمە کانیان بۆ سەر زۆربەی زمانەکانی تورکی عەرەبی ئینگلیزی تەرجەمەکراون، خۆ وەك و ئەوانەی خۆمان نین کە نازانن ئەسای بێگانەش بکەنەوە.

٧- یەکێکی تر لەهۆکارەکانی ڕووت و قوتی لە وڵاتی خۆماندا ئەوەیە کە هەندیٚ خەڵکی نەفام و نەشارەزا دەڵێن حیجاب جل و بەرگی عەرەبییە کاکە خۆ ئێمە کوردین و کلتوری ئێمە جیاوازە لە کلتوری عەرەب ئیتر بۆچی جلی عەرەب لە بەرکەین لە کاتێك

دا حیجاب جل‌وبەگێکی ئیسلامی یە نەك عەرەبی ئەنجا کەباسی جل‌و بەرگی شەرعی دەکرێت زۆرکەس وادەزانی مەبەستمان تەنها حیجاب‌و جبەیەکە و بەس بەلاّم نەخێر شەرع دەفەرموێ گرنگ ئەوە یە ئەو جل‌و بەرگە مەرجە شەرعیەکانی تێدابێ، مامۆستائەحمەد میرزا ڕۆستەمی لە کتێبەکەی خۆی دا (پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆش بەختی تاك‌و کۆمەڵە) دەڵێت ساڵی ١٩٨٠ کۆنفرانسێکی گەورە لە زانکۆی بەغداد دەربارەی جل‌و بەرگی شەرعی ئافرەتان بەسترا، یەکێ لە زاناکان کە ئامادەی کۆن فرانسەکەبوو ووتی جل‌و بەرگی کوردی باشترین جل‌و بەگە کە مەرجە شەرعیەکانی تێدابێ بەس ئەم جل‌و بەرگە کوردیە نا کە ئەمڕۆ ئافرەتان لەبەری دەکەن بەتایبەتی ئەو ئافرەتانەی کە بۆ شای و هەڵپەڕکێ و کلیپی گۆرانیەکان لەبەری دەکەن ولاّهی ئەوە بەس ناوی جلی کوردیە و مەرجەکانی جلی کوردی لە دەست داوە جل‌و بەرگی جاران پان‌و پۆڕ و فراوان و ئەستور بوو، وەلاّ ئەوانەی ئێستا حەیای جل‌و بەرگی کوردی ڕەسەنیشیان بردووە هەمویان کردۆتە سەر شێوەی شانتۆڵو پانتۆڵ و ستریَج، باشە ئەو کەسانەی کە وادەزانن حیجاب جلی عەرەبی یە خەمی میلەتی کوردیانە ئەی بۆ چی تا ناوێکی ئینگلیز و فەرەنسی وەستابێ خواردنگەو ئوتێل‌و بەنزین خانەکانتان ناوێکی کوردی لێنانێن، خۆشەویستم هەروەکو وتمان جل‌و بەگی شەرعی جل‌و بەرگێکی ئیسلامی جیهانی یە و

ئافرەتێکی عەرەبی و ئافرەتێکی ئەمریکی و پاکستانی و مالیزی وەکو یەك لەبەری دەکەن هیچ پەیوەندیەکی بەزمانو نەتەوەی عەرەبەوە نیە، هەروەکو چۆن خۆتان دەڵێن چاکەتو پانتۆڵ جلێکی جیهانیە کەمن دەتوانم بۆتی بسەلمێنم کە جلو بەرگێکی ئەوروپی یە.

٨- یەکێکی تر لە هۆکاری ڕوت و قوتی چەواشە کردنی بێ بنەمایە هەندێك خەڵکی تر دەڵێن: خوشکی خۆم ئەگەر لەچکت لە سەردابێت کەس سەیرت ناکات و گران فێر دەبیت ، فێری دەرس و دەور نابیت و ناتوانیت وەك و پێویست زانستو زانیاری وەرگریت، بەڕاستی ئەمەزۆر دوورە لەڕاستیو بنەمای زانستی یەوە چونکە ئەمڕۆ بە هەزاران ئافرەتی بالاَ پۆش لەسەرتا سەری جیهاندا هەیەو بڕوانامەی دکتۆرای لەزانستە کانی فیزیاو کیمیاو زانستەکانی تردا بەدەست هێناوە.

٩- یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ڕووتو قوتی ئەوەیە کە هەندێك لە ئافرەتان دەڵێن کە هێشتا گەنجم باپیربم کە شوم کرد ئەنجا خۆم دا دەپۆشم، زۆر ئافرەت هەیە دەڵێت ئەگەر خۆم داپۆشم، داواکارم نابێت، لە وەلاَمی ئەو خوشکە بەڕێزانە شا دەڵێن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ (إنَّ العبد لیحرم الرزق بذنبٍ یُصبهُ) زۆر جار مرۆڤـ ژن بێت یان پیاو خوا لە ڕزقێکی حەڵاڵ بێ بەشی دەکات بە هۆی تاوانێکەوە، خوشکی بەڕێزم تۆش خۆت داناپۆشی دەڵێ ی باڕیگری شو کردنم لێ

نەکات؟ بەلاّم لەوانەیە بەهۆی ئەو گوناحەوە کە خۆ دانەپۆشینە خوا بیّ بەشت بکات لە هاوسەری ژیان، یان توشت بکات بە پیاویکەوە سەد خۆزگە بخوازی کە شوت نەکردایە کەوابیت لەوانەیە خوا بەهۆی ئەو گوناحەوە خوا بیّ بەشت بکات لە پیاویکی موسلّمانی بە ڕەوشت نەك بە هۆی خۆداپۆشینەوە. کەواتە خوشکانی ئازیز ئاگاداری حیجاب و خۆ داپۆشینی خۆتان بن، تەماشای ئافرەتە موسلّمانەکانی سەلەفی صالحی ئەم ئومەتی ئیسلامە بکەن (عطای کوڕی ئەبی رباح) ئەفەرمویّ ڕۆژیکیان عبدالله کوڕی عباس (ڕەزای خوای لە سەربیت)بانگی کردم و فەرمووی (ألا أُریكَ إمرأَتً مِن أهل الجنة؟!) وەرە با ئافرەتیکی بە هەشتیت نیشان بدەم؟! منیش ووتم ئادەی بفەرموو، فەرمووی (هذه المرأَةُ السَّوْداءُ أَتَتِ النبيَّ – صلى الله عليه وسلم – فقالتْ انی اصرع و إِنیّ أَتَكَشَّفُ فادعُ الله لي ) فەرمووی ئەم ئافرەتە ڕەشە کاتی خۆی هاتە خزمەتی پیغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ووتی ئەی پیغەمبەری خوا من فیم لیدیّ و لەو کاتەیا کە فییەکەم لیدیت، ئاگام لە خۆم نامینیّ و جل و بەرگ بەبەر خۆمەوە ناهیلم، جا هاتومەتە خزمەتت بۆ ئەوەی لە خوا بپاڕیتەوە بۆم کە چاکم بکاتەوەو لەم نەخۆشیە ڕزگارم بیّ پیغەمبەری خواش (صلى الله علیه وسلم) فەرمووی (إِن شئتِ صبرتِ ولك الجنةُ و إِن شئتِ دَعوتُ الله أَن یُعا فَیكَ) فەرمووی ئەگەر حەزدەکەیت ئارام بگرە لەسەر ئەو فیّ لیهاتنەت و

خوای گەورە بە بەهەشت پاداشت ئەداتەوە و لەقیامەتیشدا ئە چیتە بەهەشتەوە، ئەگەر حەزیش ئەکەی لە خوای گەورە نە پاڕێمەوە بۆت کە چاکت بکاتەوەو شیفات بۆ بنێریو جارێکی تر توشی ق لێهاتن نەبیت ، ئافرەتەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەر چەندە بەهۆی ئەو ق لێهاتنەوە زۆر نارەحەت دەبم و ئازاری زۆر دە چێژمو جاری واهەیە خەڵك گاڵتەم پێ ئەکەن و بە شێتم ئەزانن، بەلاّم بەهەشت ئەوەندە خۆشو نەبڕاوەیە ئارام دەگرم قەیناکە با چاك نەبمەوە. بەلاّم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ، ئەوەندەهەیە (إنّي أتَكشّفُ فادعُ الله لي أن لا أتَكَشّفَ) من کاتێ فێم لێدیێ ئاگام لە خۆم نامێنێ و جلو بەرگ لەبەر خۆم دەکەمەوە لاشەم بەدەر ئەکەوێت. بەڵکو نخوا بۆ ئەمەیان لە خوا بپاڕێتەوە بۆم کە لە کاتی ق یەکەم دا خۆم ڕووت نەکەمەوە و لەشم دەرنەکەوێ !! پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دوعای بۆ کرد کەلەکاتی ق لێهاتنەکەی دا جلو بەرگ لە خۆی دانەکەنێ وجەستەی دەر نەکەوێت[٤٦] ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە چونکە دیارە بە لای کەمەوە ئافرەتەکە دەمو چاوی دیاربووە ئەگینا چۆن زانرا ئەو ئافرەتە ڕەشەو بە (هذه المرأة السوداء) وەسف کراوە.

جا تەماشاکەن چۆن ئەو ئافرەتە داوا لەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکات کە دوعای ئەمەی بۆ بکات کە لەکاتی ق لێهاتنەکەیدا کە لەدەرەوەی ویستو ئیرادەی خۆی یەتی، خۆی ڕووت نەکاتەوە و لاشەی دەر نەکەوێت، کەچی بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرن ئەو

---

[٤٦] ئەم فەرمودەیە امامی احمد ریوایەتی کردووە.

ژن و کچانەی بەشوێن فرسەتێك دا ئە گەڕێن بۆ ئەوەی بچنە ناو ئاهەنگ و بۆنەو حەفلەیەکەوە و لەوێ دا خۆیان ڕووت بکەنەوەو سەماو ڕەقس بکەن و ئەو هەموو گورگە چاو برسیەش تەماشای بکەن!!

ئەی داوێن پاکی چیی لیهات؟! بۆ یە خوشکانی بەڕێزم ولأهی کۆمەڵگا موحتاجی بالأپۆشی تۆیە، حیجاب تەنها بۆ خۆت نیەو بەس، بەڵکو بۆ تاك بەتاکی کۆمەڵگایە تا داوێن پاکی بلأو بێتەوە، چونکە کە حیجاب زۆربێت داوێن پاکی زیاد دەکات! بەڵگە نەویستە مێش و مەگەز لە شیرینیەك و چەوریەك دەدا کە داپۆشراو نیە، مێش حەزی لە شوێنێکە کە بەربەستی پاکی پێوە نەپێچراوە! زۆر پێویستە خوشکی بەڕێزم شانازی بە حیجابەکەتەوە بکەیت، چونکە هەمو شتێکی گەورەو خاوەن قەدر لەم کەونەدا بالأ پۆشە،ئەوەتا زەوی کە بێشکەی ژیانەو لانەی هێمنی ئینسانەکان و گیانداروبێگانە، بە بەرگە هەوا دەورە دراوە،خۆ ئەگەر یەك درزی بچوك بکەوێتە ئەو بەرگە هەوایە وە ئەوا ژیان لەسەر زەویدا نامێنێ! سەدان و هەزاران بەردو نەیزەك ئەم زەویە وێران دەکات بۆنمونە لە ساڵی ١٩٠٨ بەردێکی زۆر گەورە لە وڵاتی سیبریا لە یەکیەتی سۆڤێتی جاران لە ئاسمانەوە کەوتە خوارەوە ٣٠٠ مەتر ئەبوو زانایان دەڵێن کێشی تەقینەوەکەی ١٠٠ مێگا تەن بوو ، ٧٠٠ میل زەوی تەخت و خاپور کرد نزیکەی ڕووبەری ٧٠٠٠٠ مەتر زەوی لەناوبرد ، زۆر وڵاتی ئەوروپای ڕوناك کردەوە . زانایان دەڵێن ڕۆژانە هەزاران بەردی ئاوا گەورە و نەیزەك لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە

بەڵام بە هۆی ئەو بەرگە هەوایەی کە خوای پەروەردگار بۆی دروست کردووە ئەم زەویە دەپارێزێت بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێت ئەینا بەچەند بەردێك ژیان لەم سەر زەویە تێك دەچوو کەواتە ئینسان بە وردی بیر بکاتەوە ئەو بەرگە بۆتە سەبەبی سەلامەتی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر زەوی بۆیە پێویستە خوشکان و دایکانی بەڕێز شانازی بە حیجاب و بالاّ پۆشیەکەیانەوە بکەن یان ئەو میوانەی کە رۆژانە بۆ خواردن بەرکاریان دێنی، تەماشاکەن ئەوانەی کە بالاّ پۆشن پاکترو خۆشترن ئەوەتا مۆز پرتەقاڵ و هەنار چەند جوان و پاکن، چونکە بە بەرگێکی شایستە بالاّپۆش کراون.بەڕاستی خوشکانی داپۆشراو بالاّپۆش قەلاّیەکی بەهێزن و هەرگیز چاو برسیان و تەبیعەت گورگان ناتوانیّ بەکەس بلّیّ سەیرم مەکە چونکە خۆڕوت کردنەوە تەنها بۆ تەماشاکردنە!! کەواتە خوشکانی ئازیز پاکی کۆمەڵگا بەستراوە بەئێوەوە، چونکە شەرم و حەیا بە سروشتی لە ئافرەتا زیاترە لە پیاو، تەماشای قورئانی پیرۆز بکەن و بە وردی سەرنجی بدەن کاتیّ کە خوای گەورە باسی زینا دەکات و دەفەرموێت: ( الزانیـةُ و الزّانـي) ژنی زینا کارو پیاوی زیناکار،ژنەکەی پێش پیاوەکە باسکردووە، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئافرەت ڕوو نەداتە پیاو،هەرگیز پیاو زاتی ئەوە ناکات بە چاوی خیانەت تەماشای ئافرەت بکات،بەلاّم کە باسی دزی دەکات دەفەرموێت (( السّارِقُ و السّارِقَةُ )) دزی پیاو دزی ژن دەبیّ دەستیان ببڕیّ، لێرەدا پیاوی پێش خست چونکە زۆربەی دزی پیاو دەیکات نەك ئافرەت.

خۆشەویستان ڕوت و قوتی یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت بۆ یە لە کاتی ڕووح کێشاندا حەزرەتی جبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرموی: ئەگەر حەزدەکەیت خوا ئەمانەتی ڕووحت لێوەرگرێتەوە، ئەگەر حەزیش دەکەیت تا قیامەت بە زیندوی بمێنیتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: (بلْ الرفيق الاعلى) دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆلای خواو ژیانی هەتا هەتای دونیام ناوێ بەلاّم فەرموی ئەی حەزرەتی جبریل لە دوای مردنی من تۆ جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەرزەوی، حەزرەتی جبریل فەرموی: ئەی خۆشەویستم (محمد) کە تۆ مردی، وەحی خوا کۆتای دێت واتە: خوا دینەکەی خۆی تەواو کرد هیچ کەم و کوڕی بەسەرا نایەت بەلاّم من دە جاری تر دەگەڕێمەوە بۆ سەر زەوی بەلاّم دەشتی گرنگ و بە نرخ لەم سەرزەویەدا هەڵ دەگرمەوە:

**یەکەم:** فەرموی (أرفع بَركة في الأرض) بەرەکەتی زەوی نایەڵم هەرچەندە هەوڵ و تێکۆشان بکەی زەوی بەرەکەتی نامێنێ بۆ نمونە جاران کابرایەکی جوتیاری خۆمان تەنەکەیەك گەنمی بە جوتی گا دەکرد کە چی بەرەکەتی تێدابوو بەلاّم ئێستە دوسێ فەردە گەنم دەکات جار واهەیە بە حەلا حەلا بنە تۆوەکەی دەست دەکەوێتەوە.

**دووەم:** فەرمووی ( خۆشەویستی لە ناو دڵی خەڵکا دەردێنم کەس لەبەر خاتری خوا کەسی خۆش ناوێت زۆربەی خۆشەویستیەکان بەرژەوەندی دونیای پێکیانەوە دەبەستێتەوە وەلاّهی زۆریك لە خەڵکی وای لێهاتوە کە ئیشێکی پێت نەبێت تۆی ناوێت.

**سێیەم:** فەرموی: سۆزو بەزەیی لە دڵی خەڵکا دەردێنم تاوای لێ دێ برا لەگەڵ برا خزم لەگەڵ خزم ڕەفیق لە گەڵ ڕەفیقا سۆزی نامێنێ خەڵك براکەی خۆی فەقیربێ دەڵێ: خوێڕیە مەرحەبای ناکەم ئەگەر پیاو بوایە پارەی دەبوو، کە ئەمڕۆ زۆربەی ڕایەڵەکانی خزمایەتی و دۆستایەتی پارە دروستی کردووە، خۆشەویستی نەما! بەزەی نەما! سۆز نەما!.

**چوارەم:** فەرموی دادگەری لەدڵی کاربەدەستەکاندا دەردێنم واتە دادگەری لەسەر زەویدا نامێنێ، جیاوازی چینایەتی و گەندەڵی پاشا گەردانی زیاد دەبێت هەرچی دێتە سەرحوکم چونکە دینی نیە خەڵك سەد خۆزگە بەوەی پێشوتر دەخوات. دەڵێت خۆزگە لایان نەبردایە.

**پێنجەم:** فەرمی (أَرفَعُ الحیاءَ مِن النسَاءَ) شەرم و حەیا لەناو ئافرەتانا هەڵ دەگرم، ئەی نازانی جاران ئەو خوشکە بەڕێزەی لە سەری کۆڵانێکەوە پیاوێکی ببینیایە خێرا پەلاماری لە چکەکەی دەدات بەداخەوە ئێستە پێی عەیبە لەسەری بکات یان لەسەری دەکات بەڵام نیوەی قژی بەدیارەوەیە! وەڵاهی جاری واهەیە دەچی بۆ ماڵی خزمێکت برادەرێکت ئەوەندە ئافرەتەکانیان ڕووتن سەد خۆزگە دەخوازی نەچویتایە لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە ئەو ئافرەتانە ئەو خۆ ڕووت کردنەوانە بە پێش کەوتن و ئازادی دەزانێ!؟.

**شەشەم:** فەرموی صبرو ئارام لە دڵی فقیرا ناهێڵم.

**حەوتەم:** فەرموی: ( أرفَعُ الورع و الزهر مِن العلماء ) زانایانی ئەم دینە دونیا پەرست و پارە پەرست دەبن وارع و دونیا نەویست نابن حەزرەتی جبریل فەرموی وەرع و دونیا پەرستی و بێ تەماعی لە دڵی

زاناو عالمەکان دەردێنم بەداخەوە بۆ یە ئەمڕۆ هەندێ بەناو زانایان و هـەڵگرانی پـەیامی خـوا دونیـا پەرسـتن و دینەکـەیان بـە دونیـا گۆڕیوەتەوە.

**هەشـتەم:** فـەرموی: سـەخاوەت لـە دڵـی دەوڵەمەندەکانـدا دەردێـنم، تاوای لێدێت دەوڵەمەنـد بە هـەموو دونیـا تێر نـاخوات، واتـە هـەموو دونیای هەبێت هێشتا قەناعەتی پێی نیە و دەڵێ: بە خوا لەوانەیە لـە برسا بمرم.

**نۆیـسـەم:** فـەرموی: کـەئاخر جـاریش هاتمـە سـەرزەوی قورئـانی هەڵدەگرمـەوە بـەیانی کـە خـەڵك لـە خـەو هەڵدەسـتن سـەیردەکەن قورئانەکە یەك حەرفی تیا نەماوە هەمووی هەڵ گیراوەتەوە و چۆتەوە بەرەو ئاسمان لاپەڕەکان بە سپێتی ماوەتەوە.

**دەیـەم:** (أرفـع الأيمـان) فەرموی: جـاری دەیـەم و کۆتـای کـە هاتمـەوە سـەرزەوی پـێش هـاتنی قیامـەت، ئـەمجارەیان ئیمـان هەڵدەگرمـەوە، ئـەوەی کـە مـسقاڵە زەڕەیـەك ئیمـان لـە دڵیابێـت ئیمانەکـەی هـەڵ دەگرمەوە، یەك ئیماندار لەسەر زەویدا نامێنێ، قیامەت بەسـەر کـافرا دێـت، ولأهـی ئـەم فەرمودانـەی کـە حـەزرەتی جبریـل لـە خزمـەتی پێغەمبەرا (صلی الله علیه وسلم) باسی کردن هـەمویان هاتونەتە دی تـەنها هـەڵ گرتنـەوەی قورئان و ئیمـان نەبێت. فەرموی: حیجاب و بالأ پۆشـی کە نیشانەی شـەرم و حـەیایی ئافرەتـە نـامێنێ فەرموی: شـەرم و حـەیا لـەدڵی ئـافرەتی ئیمانـدارا نـامێنێ بۆ نمونـە لـەکاتی نوسینی ئـەم باسـەدا لـە یـەکێ لەڕۆژنامـەکانی کوردسـتانی خۆمانـدا نوسراوێکم خوێندەوە باسی کچێکی میصری دەکات کە خوێنـدکاری

زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە دەڵێ: لەداخی ئیسلامیەکان کە بانگەواز بۆ حیجاب و بالاپۆش ی ئافرەتان دەکەن وێنەی خۆی بەرووتی لەسەر پەیجی تۆڕی کۆمەلایەتی فەیس بووك بلاو کردەوە هەروەها ئەم کچە کەناوی (عەلیا ماجیدە مەهدی) تەمەن بیس ساڵە وێنەیەکی دیکەشی بلاو کردۆتەوە کە بەرووتی وەستاوەو قاچی خستۆتە سەر سەرپۆشێك کە بە هێمای کۆیلایەتی ژنان ناوی بردووە ئەمەش لە داخی ئەوەی کە بە پێی ئەو ئامارانەی لە دوای رووخانی رژێمی گۆڕ بەگۆڕی (حسنی مبارك)ەکەوە لەبەردەست دان ژمارەی ئافرەتانی محەجەبە رۆژ بەرۆژ لە زیاد بوندان بە تایبەتیش لە دوای رووخانی رژێمەکەی حوسنی موبارەکەوە، ژمارەیەکی زۆری ئیسلامیەکان لە سعودیەو ولاتانی تری عەرەبی و ئەوروپی و ئەمریکی یەوە گەڕاونەتەوە بۆ میصر کە لە پێشتردا لەسەر بیری ئیسلامەتی دەرکراون. بۆ یە حەزرەتی جبریل فەرموی: شەرم و حەیا لە دڵی ئافرەت نامێنێ، ئەمڕۆ شەرم و حەیا نەما و رێز و ئەدەب نەما هەمووی باری کرد هەموی بزربوو، زۆربەی خەڵکیش تانەو تەشەر لە بالاپۆشی و حیجاب دەدات و دەڵێ: خۆداپۆشین نیشانەی دواکەوتووی و گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی سەدە تاریکەکانی رابردوو ئێمەش لە وەلامدا بەدڵسۆزیەوە بە هەموو ئەو کەسانەی کە بیرو بۆ چونیان وایە دەڵێین: هەرکەسێ تۆزێ لە مێژودا شارە زایی هەبێت ئەزانێ کە روت و قوتی نیشانەی دواکەوتوی و گەڕانەوەیە بۆ سەردەمە تاریکەکانی رابردوو، نەك

بالاّ پۆشی چونکە یەکەم جار سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتی کە لە ئەشکەوت‌و شاخەکاندابوو، ڕووت بوو!؟. دوای وردە وردە ئەو شتانەی کە ڕاوی دەکرد پێستەکەیانی بۆ خۆ داپۆشین بە کار دەهێنا ئەنجا هاتە پێدەشتەکان و خانوی دروست کرد و تۆزێ پێشکەوت. واتە بەڕێزەکەم ئەی ئەو کەسەی کە زۆر خۆت بە ڕۆشنبیرو پێش کەوتوو دەزانی، یەکەمجار کە خەڵك دواکەوتو بوو ڕووت بوو دوایی کە پێشکەوت شارستانی‌و ژیانی پەیدا کرد خۆی داپۆشی و چەندین کارگەی جل‌و بەرگ دروست کردن پەیدابوو، خۆ ئەگەر پێشکەوتن‌و ڕۆشنبیری بەڕووتی بوایە دەبوایە ئەفریقا لە پێش ئەوروپاو ئەمریکا بوایە خۆ ئەگەر بەڕووتی بوایە حەیوان لە مرۆڤ پێشکەوتوتر نەبوو.

خۆشەویستان خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزا دەفەرموێ: (و لا تتبعُوا خُطُوات الشيطان......) شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون خۆ شەیتان ڕاستەوخۆ پێت ناڵێت لە چکەکەت فڕێدە، حیجابەکەت فڕێ دە هەنگاو بە هەنگاو وردە بە وردە دێتە پێشەوە و یەکەمجار دەڵێت: با لە چکت لەبەرابێت بەس با تۆزێکی قژت بەدیارەوە بێت، ئەگەر بەقسەت کرد، جارێکی تر لە حەفلەی براکەتا دەڵێ کورە خۆ هەمو ڕۆژێ براکەت یان کوڕەکەت ژن ناهێنێ، قەیچێکە لە شاییەکەی دا لە چکە کەت فڕێ دە، کە ئەوەشت بە قسەکرد، ئەڵێ وەکو خەڵك تەنورە لە پێ کە دوایش دەڵێت قەیچێکە با تەنورەکەشت دوو فەتحەی لە

پێشەوەو دواوە تیابێ تا وردە وردە ڕووتت دەکاتەوە هەر هەست بە هیچ ناکەی هەر بە خۆشت نازانی، حەزرەتی عائیشە دایکی ئماندران (ڕەزای خوای لەسەربێت) دەفەرموێ: کاتێك کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد لە ژورەکەی منا نێژرا دوای ئەویش حەزرەتی ئەبو بکری باوکیشم وەفاتی کردووە لەپاڵ پێغەمبەرا نێژرا، دەفەرموێ: هەمو جارێك کە دەچومە ژورەوە سەرپۆشم لەسەر نەدەکرد چونکە ئەوەیان پێغەمبەری خوایە و هاوسەری ژیانمە ئەوەشیان باوکمە. بەڵام کاتێ کە حەزرەتی عمری کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد لە پاڵ پێغەمبەر و باوکمەوە نیژرا دەفەرموێ: وڵاهی هەتا لەچکم لەسەر نەکردایە نەدەچومە ژورەوە چونکە ئێستا حەزرەتی عمریان لە گەڵایەو نامەحرەمە. هەزار ڕەحمەت و بەزەیی خوا لەسەر ئەو دایکە بەڕێزە بێ لە قەبریشا شەرمی لێکردووە!؟ خوشکی بەڕێزم تۆش ئەگەر دەتەوێ شوێن کەوتەی پێغەمبەری خوا ببێت شوێنی عائیشەو فاتمەو خەدیجە بی شانازی بە حیجابەکەتەوە بکە ئەوە ناسنامەی تۆی ئیماندارە. ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی زۆری بە جلو بەرگ داوە ، إیمامی علی (ڕەزای خوای لە سەربێت) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار لەسەر ئەو پۆشاکەی کە عەورەتی خۆمی پێ دا ئەپۆشم و بە هۆیەوە لەڕووم دێت بچمە ناو خەڵکەوە،

هەرچەندە لە زەمانی جاهیلیەتی پێش ئیسلام دا خەڵکی خۆیان بە ئایین پەروەردەزانی بەڵام بەڕووتی تەوافی کەعبەیان دەکرد، بەڵام کەدینی ئیسلام هات ئەو نەریتە خراپەی گۆڕی فەرمووی ژن و پیاو فەرقی نیە ئەبێ هەردوکیان إحرام تەواو ببەستن ئەنجا تەواف بکەن نابێ بەڕووتی تەواف بکەن، فەرمووی دەبی ئافرەتانیش خۆیان داپۆشن ئەنجا تەواف بکەن، بۆ یە پیاو جل و بەرگی لەبەرابێت نیشانە نیە لە سەر دین داری و خواناسی حەزێ دەکا جوانترین و باشترین جل و بەرگت لەبەرا دەبوو کەس نازانێ موسڵمانە یان نا نوێژ کەری یان نا بەڵام ئافرەت وانیە، ئەو جل و بەرگەی لەبەری دەکا نیشانەی دینداری و خواناسیەتی، کە ئافرەتێکی داپۆشراو دەبینی یەکسەر ئەوە بەمێشکتدادێ کە ئەم ئافرەتە خواناس و نوێژکەرو دیندارە کەواتە حیجاب ناسنامەی ئافرەتی ئیمانداره. لەگەورەی حیجابە کەخوا ناوی ئافرەتی دا پۆشراوی لە گەڵ خێزان و کچە بەڕێزەکانی پێغەمبەر هێناوە، ئەوەش حورمەت و ڕێزە بۆ ئافرەت کە خۆشەویست دەفەرموێ باشترین کەس ئەوەیە کە چاوت پێیکەوت خوات بیر دەکەوێتەوە. قیامەتت بیر دەکەوێتەوە داوێن پاکیت بیرت دەکەوێتەوە، شەرم و حەیات بیر دەکەوێتەوە. بۆ یە زۆرجار برای سایەق تەکسی ووتوویەتی کە ئافرەتێکی داپۆشراو سەرکەوتووە لە گەڵما ولاهی لەئاوێنەکەشەوە لە ڕووم نەهاتووە سەیری بکەم، شەرمم لێکردووە بەڵام کە ئافرەتێکی

ڕووت و قووت سەرکەوتووە لەگەڵما بە ئارەززی خۆم سەیرم کردووە، چاوت لێیە چەند فەرقیان هەیە ئەمیان چەند گەورەیەو ئەو یان چەند بچوکە بۆ یە خوای پەروەردگار دەفەرموو (( ذلك أَن يعرفنَ)) ئەو خۆ داپۆشینە نیشانەی عیزەت و سەربەرزی ئافرەتی ئیماندارە، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان دادەپۆشن لەوانەیە لە لایەن هەندێ خەڵکەوە لۆمەو سەرزەنشت بکرێن، بەڵام بەدڵنیاییەوە لەلایەن زۆربەی کۆمەڵەوە بە چاوی ڕێزو حورمەتەوە سەیر دەکرێن بێجگە لەوەش پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە لە لایەن خواوە هەر وەکو خۆشەویستمان حەزرەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (( من وراءكم زمان صبر )) ڕۆژێ دێت بەسەر ئومەتەکەم دا، ڕۆژی صەبرو ئارام گرتنە (( للمتمسك فيه أجر خمسين شهيداً منكم )) هەرکەسێ لە ژن و پیاوی موسڵمان دەست بەم ئیسلامەوە بگرێ ئەجرو پاداشتی پەنجا شەهیدی هەیەو دە چێتە ڕیزی حەزرەتی عائیشەو خدیجەو فاتمەو مەریەمەو ئافرەتانی بەهەشتی یەوە.

# بەشی پێنجەم

## خوێندن و بالآ پۆشی (حیجاب)

خۆشەویستان ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هیچ جۆرێ لاری نیە ئافرەتیش فێری زانست و زایاری بێت، بەڵکو پێویست و واجبیشە لەسەری کە فێری کاروباری دینە کەی بێ دیارە فێری کاروباری دینەکەشی نابێت هەتاوەکو فێری زانست و زایاری نەبێت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوفەرموێ (( طلب العلم فريضة على كلٍّ مسلمٍ و مسلمةٍ ))[٤٧] فێربوونی زانست و زانیاری واجبە لەسەر هەموو نێرو مێیەك فەرقی کوڕ و کچ نیە بەلآم ئەوەندە هەیە دایك و باوکی ئیماندار کە کچەکەت ناردە قوتابخانە توخوا با داپۆشراو بێت ئەگینا وەلآهی واجبێکی شەرعیە کە دکتۆری ئافرەتمان هەبێت ئەندازیاری ئافرەتمان هەبێت مامۆستای ئافرەتمان هەبێت کچان و کیژۆڵکانمان بۆ پێبگەیەنن، دواتر پێویستە شەرعیەکانمان بۆ پڕبکەنەوە، چەندین جار لە لایەن ئەو برایانەی کە دکتۆرن پرسیارمان لێکراوە مامۆستا ئێمە چیبکەین کە شەوانە خەفەرین لە

---

[٤٧] اسنادە ضعیف، واتا بەرای زۆربەی زانایانی فەرموودەناس ئەم فەرموودەیە بێهێزە

نەخۆشخانەکان‌و خەفەری ئافرەتمان نیە ئەبێت ئێمە دەرزی لە ئافرەتان بدەین، چەند خۆشە ئافرەتان تایبەت بن بە کارو باری ئافرەتان بە تایبەتی کە ئێستە الحمدالله سەدان دکتۆر سالأنە خوێندن تەواو دەکەن. جێگەی خۆیەتی حوکمەتی هەرێمی کوردستان بیر لەم مەسەلانە بکاتەوە. چونکە ئەو میلەتە موسلمانەو بە غەیری موسلمانیش ڕازی نیە، کەواتە پێویستە دکتۆری ئافرەت و ئەندازیار و مامۆستای و هەموو پیشەکانی ترمان هەبێت بەلأم با بە جل‌و بەرگی شەرعی‌وە بخوێنن، بە داخەوە دوژمنانی خوا و ئەلقە لە گوێ یەکانی ئەوروپا و ئەمریکا دەلێن ئیسلام زولمی لە ئافرەت کردووە، چونکە ئیسلام داوای کردووە کە ئافرەت خۆی داپۆشێ‌و جل‌و بەرگی شەرعی لەبەر بکات، ئێمە لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا باسی ئەم بابەتەمان کردووە ئیسلام زۆر ڕێزی لەفێربووتی زانست‌و زانیاری گرتووە بە بێ جیاوازی ژن‌و پیاو بۆ ئەو کارە پیرۆزە هانیداوە، هەروەك لەئایەتی ژمارە یانزەی سورەتی مجادلەدا دەفەرموێ: ( ( فَانشُزُوا يَرْفَعْ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ)) ئەمەو چەندین ئایەت‌و حەدیسی تر کە خوا و پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) بە بێ جیاوازی ژن‌و پیاوی موسلمان هان دەدات بۆ فێربوونی زانست و زانیاری جا زانست و زانیاری شەرعی ئیسلامی بێت

یان زانست و زانیاری دونیای و بەڕێوەبردنی کاروباری دنیایی بێت، واتــە کەســێك بیــەوێت ببێــت بــەدکتۆرێك ئەنــدازیارێك داد وەرێــك مامۆسـتایەك....... کـە ژیـان بـە بـیٚ ئەمانـە نـاڕوات بـەڕێوە، ئـەوە کارێکی پیرۆزەو هیچ شـەرمو و حەیای ناوێت چونکە پێویستیەکی شەرعیە و هیچ شەرم کردنێکی تێدا نیە، بەڵکو پێویستیشە لەسـەری کـەدوایی هەسـتێت بـەفێرکردنو شارەزاکردنی کـچان و ئافرەتـانی هاو ڕەگەزی خۆشـی، حـەزرەتی عائیشـەی دایکـی ئیمانـداران (ڕەزای خـوای نەسـەربێت) بـۆ مـان دەگێڕێتـەوەو دەفـەرموێت ( نعـم النـساء الأنصار لم يكن يمنعهن حياءُ أَن يتفقنّ فِي الـدين )[٤٨] باشـترین ئافرەتـان ئافرەتانی پشتیوانان (الأنصار) کە شەرمو حەیا ڕێگـر نیە لەبەردەم یاندا بۆ شارە زابوونو پرسیارکردن لە دینەکەیان، وەلێرەدا نمونـەی ئەو ئافرەتە دەهێنینەوە کە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صـلی الله علیه وسلم) پرسیاری چۆنیەتی خۆپاك کردنـەوەی ئـافرەتی کـرد لـە کـاتی بێنوێژیـدا ئەمـەش بەڵگەیـەکی بـەهێزە لەسـەر ئـەوەی کـەوا ئافرەتـانی موسـڵمان پێویـستە لەسـەریان کەهـەوبی شـارەزابوونی دینەکـەیان بـدەن، هـەر حـەزرەتی عائیـشە دایکـی ئیمانـداران (ڕەزای خوای لەسەربێت) بۆ مان دەگێڕێتـەوەو دەفەرمویٚ ژنێك هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـە وسـلم) و پرسـیاری خـۆ پـاك کردنـەوەی لـە بێنوێـژی لێکـرد، کـە چـۆن خـۆیـان پـاك بکەنـەوە ؟ فـەرمووی: (خـذی فرصـة مـن مـس فتطهـري بهـا، قالـت کیـف

---

[٤٨] صحيح مسلم كتاب حيض، باب استحباب استعمال مغتسلت وضع فرصة من مسك في موضع الدم ج1 ص:261 جزء من حديث رقم 61

أتطهر؟ قال: تطهري بها. قالت: كيف؟ قال: سبحا الله، تطهري: ( فاجتذ بتها إليَّ، قالت تتبعي أثر الدَّم)[49] واته: پارچەیەك پەڕۆی پاك بێنەو خۆتی پێپاك بكەرەوه ئافرەتەكه وتی: چۆن چۆنی خۆمی پیێ پاك بكەمەوه؟ فەرمووی: خۆتی پێبسڕەوه، وتی: ئاخر چۆن؟ فەرموی: (سبحان الله) خۆتی پێپاك بكەرەوه، حەزرەتی عائیشه دەفەرموێت: ڕام كێشا بۆ لای خۆمو پێم وت: پەڕۆكه بەشوێنی خوێنەكەدا بێنه و جوان بیسڕەوەو پاكو پوختی بكەوەوه لە كاتی خۆشتنەوەت دا لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرمویَ: ( ان رسول الله (صلی الله علیه وسلم) إستحیا فأعرض بو جهه ))[50] پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شەرمی كردوو ڕووی خۆی وەر گێڕا. وەدەربارەی شەیتانی بوون واته خەوبینین ( الإحتلام ) . أم سلمەی دایكی ئیمانداران (ڕەزای خوای لەسەربێت) بۆ مان دەگێڕێتەوەو دەفەرمویَ: ڕۆژێك چومه خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتم: ( یارسوالله إن الله لا يستحي من الجف، هل على المراةِ من غسل إذاهي إحتملت؟ فقال روسل الله (صلی الله علیه وسلم) وسلم : نعم إذا رأيت الماء ))[51] ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خوای

---

[49] صحيح البخاري كتاب الحيض،باب ذالك المراة نفسها اذا تطهرت من الحيض،كيف تغتصل؟وتاخذ فرصة ممسكة اثر الدم ج١ ص١١٩ رقم حديث ٣٠٨

[50] هەمان سەرچاوه ژماره فەرموده ٣٠٨

[51] صحيح البخاري ،الغسل ،باب اذا احتملت المراة ص١٠٨ رقم الحديث ٢٧٨.

گەورە لە ئاستی هەقدا شەرم ناکات ئایا ئافرەت ئەگەر إحتلام بوو واتە: لە خەودا شەیتانی بوو خەوی بینی غوسڵی دەکەوێتە سەرو دەبێ خۆی بشوات؟ فەرموی: بەڵێ ئەگەر لە خەو هەستا و هەستی بەخۆی کرد کە لەش و جلەکانی تەڕەو ئاوی بینی، بۆ یە واچاکە چ ئافرەت و چ پیاو کەلە خەو هەستا دەستێك بەداوێن و جلەکانی داوێنی خۆی دا بێنێ ئەگەر بینی جلەکانی تەڕبووە، دەبێ خۆی بشواو غوسڵی دەکەوێتە سەر، دەبێ بشزانێ ئەم ئاوە یان تەڕبوونی جلەکانی دوو جۆری ئاو هەیە یە کێکیان پێی دەڵێن (مذی) و کە ئاوێکی ڕوون و لینجە ئەوە لەشی پێ پیس نابێ تەنها جلەکانی و شوێنەکەی دەشۆرێتەوە، بەلاّم ئەو ئاوەی کە لەشی پێ پیس دەبێ ڕەنگی سپیەو بە خەست و خۆڵی و بە فیچقە دێتە دەرەوەو لە شی مرۆڤ ڕادەچەنێت ئەوە لەش پیس دەکات و دەبێت خۆی بشۆرێت[52]

بەڵێ خۆشەویستان ئێستا تێگەیشتین کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانی هەردوو ڕەگەزی نێرومێ ، کچ و کوڕ ، ژن و پیاو ئەدا بۆ فێربوونی زانست و زانیاری بە داخەوە جێگای ئەسەفە تۆی موسڵمان واتێ بگەی کچەکەت بەڕووتی نەڕواتە دەرەوە فێری علم نابێ وابزانی ئەگەر قاچی ڕووت نەبێ و قۆڵی ڕووت نەبێ و قژی ڕووت نەبێ فێری عیلم نابێ ، الحمدالله واقع ئەوەی

[52] احمد میرزا رۆستەمی (پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆشبەختی تاك و کۆمەڵە ۱۷۰ ، ۱۷۱

بەدرۆخستۆتەوە ، ئەوەتا لەماوەی ئەم بیست ساڵەی ئەزمونی حکمڕانی کوردی دا هەندێ ساڵ یەکەمەکان و دووەمەکان و سێ یەمەکان و عەشرە ئەوائیلیەکانی ئەم هەرێمی کوردستانەی خۆمان لەکچە داپۆشراو موحەجەبەکانن لەوانەن کە قورئان خوێن و ئەهلی مزگەوتن ، چونکە ئێمە مەبدەئێکمان هەیەو بۆ شتێك دەژین زۆر گەورەترە لە ژیانی هاکەزایی دونیای و قیامەتمان چاولێ یە. لەبەرئەوە خۆشەویستانم دایکان و باوکانی بەڕێز بەوەی کچەکەت و کوڕەکەت لە غەربیەك و ئەوروپیەك بچێ بە ڕووتی و قوتی پێش ناکەوێ چونکە ئەو بەڕووتی و قوتی دەستی بەسەر دونیادا نەگرتووە ، ئەو بەعلم و زانیاری گەیشتە سەرمانگ و مەریخ ، ڕەحمەتی خوا لە دکتۆر محمد إقبال لاهوری بێ کە لە شعرێکی دا زۆرجوان ئەمەی باس کردووە کە تەرجەمە کوردی یەکەی ئەمەیە کە من بۆتانی دەخوێنمەوە و زۆرجوان ئامۆژگاریان دەکاو دەڵێت

خەڵکینە وریا بن شەرق کە لاسای غەربی کردەوە

وایزانی گـــرەوی ژیـــــانی بـــــــردەوە

پێش کەوتنی غەرب نە ناعــــــــــورەو نە ساز

نەڕەقص و ســـــەمای کچی جەنەبــــــــاز

نە جادوی ژن و نە خـــــــــــــاڵی ڕووە

نە قاچ ڕووتی وبڕینی مـــــــــــــــــووە
نـــــە ئازایـــــــەتی و نەبێ دینی یە
نەلەبەر ســــۆزو خۆشـــەویستی یە
پێشکەوتنی وان عـــــــلم و سەنعەتە
ئەویش بەرهەمی هـــەوڵ و هیمەتە
بەختەوەری ژین هەتا ڕۆژی مـــــەرد
زانست دەیهێنێ نەک پۆشاکی تەنک

کەواتــە: پــەروەردەو ڕەوشــت بناغــەی فێربــوونی علــم و زانیاری یە بۆیە تۆی دایك و باوك و ئیماندار هەوڵ بدە کچەکەت پــەروەردەو ڕەوشــتی لەدەســت نــەدا بــا ئەگــەر لــە خوێنــدنگاو قوتابخانـەکان شەهادەشـی نەهێنایـە ڕەوشـت پـەروەردە لەگـەڵ خۆیـدا بهێنێتــەوە کــە بناغــەو بنــچینەی خوێنــدن لەســەر ئــەوە دامەزراوە چونکە باوەڕتان هەبێ ئەو هـەموو خوێنکـار و قوتـابی یـەی کـە ڕوو لـە خوێندنگـەو قوتابخانـەکان دەکـەن هـەمووی هـەر نـابن بـە دکتـۆر هـەر نـابن بـە ئەنـدازیار هـەمووی هـەر نـابن بـە دادوەر و محـامی هـەمووی هـەر نابن بە مامۆسـتا بـەڵام واجبـە هـەموویان ڕەوشــت و ئـەخلاقیان هـەبێ زانایـەك فەرمویـەتی: پرسـیان لـە سـەروەت و سـامان وتیـان: ئـەی سـەروەت و سـامان ئەگەر تۆ بزربووی لە کوێ دا بۆت بگـەڕێین و بتدۆزینـەوە ووتـی:

لە کۆشکی پیاوە دەوڵەمەندەکان و لە بانقەکانی حکومەت دا بگەڕێن لەو شوێنانەدا پارە زۆرەو دەیدۆزنەوە لە زانست و زانیاریان پرسی ئەی علم و زانیاری ئەگەر تۆ بزربووی لە کوێدا بۆت بگەڕێین؟ ووتی: لە خوێندنگا سەرەتایی و ناوەندیی یەکان دا لەزانکۆو دانیشگاکاندا بگەڕێین لەوێدا علم و زانیاری زۆرە وە دەیدۆزنەوە، لەئەخلاق و ڕەوشتیان پرسی ئەی ئەخلاق و ڕەوشت ئەگەر تۆ بزربووی لە کوێدا بۆت بگەڕێین ووتی یەك زەڕە بۆم مەگەڕێن ووتیا بۆچی؟ ووتی: چونکە ئەخلاق و شەرم و حەیا کەڕۆیشت تازە دەست ناکەوێتەوە بەلاٌم علم و زانیاری وانیە ئەگەر قوتابی یەکە ساڵێکیش دەرنەچێ دەتوانێ ساڵی دووەم و سالآنێکی تر قەرەبووی بکاتەوە بەلآم شەرم و حەیا وانیە هەر لەبەر گەورەی ڕەوشت و ئەخلاقە لە ولآتە ئیسلامی یەکان دا ئەو وەزارەتەی کە تایبەت کراوە بەخوێندن پێی دەوترێ ( الوزارة التربية والتعليم ) وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن ئەها پەروەردە لەپێش علمەوەیە. بۆیە ڕوو لەهەموو دڵسۆزان مامۆستایانی بەڕێزی ئەم کوردستانە دەکەم، کە لەدانانی سیستەمی خوێندن دا سەیری دین و ژینی ئەم میللەتە بکەن و سیستمێك دابنێن کە لەگەڵ دین و کلتورو مێژوی ئەم میللەتەدا یەك بگرێتەوە، بەخوا واقعی ولآتانی دونیا ئەم ڕاستی یەی سەلماندووە، ئەوەتا دکتۆر ( دارکونان ) دکتۆرێکی ئەمریکی یە و پسپۆڕە لەبواری پەروەردەی دا دەڵێت :

پـەروەردەو فێرکـردن کـاڵاو کـەل و پـەل نیـە لـە وڵاتـانی دەرەوە بیهێنـی بـەڵکو پرۆسـەیەکە ئەبێت لـەناو خـۆی خۆتـا هـەڵبقوڵێ ئـەڵێت: ئێمـە وەك و گـەلی ئـەمریکا چـەند سـاڵێك سیـستەمی بـەریتانیامان هێنـا لـە ئـەمریکا جـێ بـەجێمان دەکـرد هـەموو خوێندکارو قوتابی یەکانمان فاشل بوون ، چونکە بیرمان کردەوە کە ئەو سیستەمەی بەریتانیەکان بۆ وڵاتی ئەمریکا نابێت ، جا وەرە پسپۆڕانی بـواری پـەروەردەیی و ڕۆشـنبیران و دڵـسۆزانی بنیات نەری نەوەی نوێ ی ئەم کوردستانە ئەمریکاو بەریتانیا دوو وڵاتـی مەسـیحین دوو وڵاتـی هاوپـەیمانن لـەدێر زەمانـەوە دوو وڵاتـن لـەڕوی جوگرافیـەوە دراوسـێ و نـزیکین لەیـەك دوو وڵاتـن زۆربـەی ئەمریکی یەکانیش کـاتی خـۆی لە بـەریتانیاوە چـونەتە ئەمـەریکاو تائێـستاش پەیوەنـدی خزمایـەتی لـە بەینیانـدا هـەرماوە دوو وڵاتـن بەیـەك زمـان قسە دەکـەن، کەچـی یـەك سیـستەم بـۆو دوو وڵاتـە نـاخوات. بۆیـە دکتـۆر دارکۆنـان دەڵێـت ئێمـە بەخۆمانـدا چـوینەوە و بڕیارمانـدا سیـستەمێکی پـەروەردەی نـاو واقعـی گـەلی ئـەمریکا دابنـێین فعلـەن کـە سیستەمەکەشمان دانا خوێندکارەکانمان سەرکەتووبوون جا وەرن دڵسۆزانی دیـن و وڵات بەراوردێك لە بـەینی کوردسـتان و سـوید و نـەرویجیا بکـەین لـە ڕوی دیـن و جـرگراف و مێـژوی ئاستی ڕۆشـنبیری یـەوە بزانـە ئاسمـان و ڕێسمانی فەرقە یـان نـا؟!. سـوید کـە بەحـەیاتی کارەبـای نـابڕێ و سـایەقێك لـەمێلی

سوری ترافیك لایتیك تێ ناپەڕێ و کوڕی سەرۆك وەزیران لەگەڵ کوڕی هەژارێك دا لەبەردەم یاسا دا هیچ جیاوازیەکیان نیە بزانە ئەم دوو وولاتە چەندیان فەرقە. بۆیە پشتیوانی خۆم بۆهەموو خوێنکار و قوتابییە ناوەندی و دواناوەندی یەکان دەردەبڕم کە ناڕەزاییان دەربڕی و دەیان ووت: ئێمە ژیانمان ئەفریقی یەو سیستەممان سویدی یە .

# بەشی شەشەم

**ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی زیناو داوێن پیسیەوە توشی مرۆڤ دەبن.**

لەبەر ئەوەی پەیوەندیەکی بەهێز لە نێوان ئەو نەخۆشیانەو بابەتەکەی ئێمەدا هەیە بۆ یە پێم باش بوو لەم بەشەی باسەکەمان دا باسێکی ئەو نەخۆشیانە بکەم کە بەهۆی زیناو رووتی و قوتیەوە بلاو دەبێتەوە. چونکە ئەم نەخۆشیانە بەهۆی تێکەلاو بونی نێرو مێ و، فڕێدانی پۆشاکی شەرعی یەوە دروست دەبێ چونکە لە ئەنجامی خۆ ڕووت کردنەوەی ئافرەتان و تێکەلاو بوونیان بە پیاوانی نامەحرەم و جوت بونی ناشەرعیەوە دروست دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی بلاو بونەوەی چەندین نەخۆشی کوشندە و نالەبار کەخوای پەروەردگار وەك سزایەك چەندین نەخۆشی بۆ ئەو کەسانە دەنێرێ کە خەریکی بەرەلای و داوێن پیسین، پەنا بەخوا هەرکەسێکیش توشی ئەو نەخۆشیانە بێت سەرەنجام دەمرێت، بۆ یە پێم خۆش بوو کورتەیەك لەو نەخۆشیانە بکەم بە بەشێکی کتێبەکەم و باسی بکەم.

خۆشەویستان ئەو نەخۆشیانەی توشی کۆ ئەندامی زاو زێ ی ژن و پیاو دەبن کە خەریکی داوێن پیسی و زیناکردن،

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (( یامعشر المهاجرین: خمس خصال إذا أبتلیتیم بهن ی أَعوذُ بالله ان تدرکوهن، لم تظهر الفاحشه في قوم قط حتی یُعلِنُوابها الاً فشافیهم الطاعون و الأَوجاع التی لم تکن مَضَت في أَسلافهم الذین مَضُو..........))[٥٣] دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی کۆ چەرانی صحابە، ئەی ئەی کەسانەی کە لەبەر خاتری خوا ماڵ‌ومنداڵ و نیشتمانی خۆتان بە جێهێشتووەو لەبەر ڕەزامەندی خوا لە مەکەوەکۆ چتان کردووە بۆ شاری مەدینە، پێنج سیفەت هەن داواکارم لە خوای پەروەردگار کە نەیان بینن‌ولە ناوتانا دەر نەکەوێ، ئەو یش داوێن پیسی و زینا کردنە چونکە لە ناو هەر گەل‌و میللە تێکدا بە ئاشکرا دەر کەوێ و خەڵك هەموی سەری تێبکا و نەگەڕێتەوە ئەوە خوای گەورە ئەو کەسانە بەشێوەیەك توشی نەخۆشی تاعون‌و ئایدزو نەخۆشی جۆراو جۆرو و ئەشکەنجە و ئازار و برسێتی‌و ترسان دەکات کە لە ناو میللەتانی پێش خۆتان دا نە بووە هەر بۆ یە خوای پەروەردگار ڕێگە لە داوێن پیسی زینا دەگرێت‌و، لە هەمو شەریعەتە ئاسمانی یەکانی خۆی دا چەندین یاسای بەرزو جوانی بۆ داڕشتووەو بە هەموو شێوەیەك دە یەوێت مرۆڤ لە کاری بەرەڵای‌و داوێن پیسی دوربخاتەوە، وە بە چەندین فەرمودەش کاری سێکسیش بۆ ڕێك خستوین، جا

---

[٥٣] رواه ابن ماجه،وصححه الالبانی (١٠٦)في السلسلة الصحیحة.

خۆش بەختی بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەس بە یاساو ڕێسای خواوە دەگرن، بە تایبەتیش لەدینی پیرۆزی ئیسلام دا کەوا وەك و دوا پەیامی خۆی ناردوویەتی بۆ ئومەتی محمد المصطفی (صلی الله علیه وسلم)و هانی گەنج و لاوەکان دەدات بۆ زوو ژن هینان و شوکردن چونکە هۆکارێکی گەورەیە بۆ ڕێگیری کردن لە زیناو داوێن پیسی هەروەها بە چەند فەرمودەی تر ڕێگری لە تێکەڵاو بوونی ژن و پیاوی نامەحرەم دەگرێت چونکە ولاهی لە ئەنجامی تێکەڵاو بون دا، چاوەکان بەرەڵا دەبن پاشان نەزەر کردن زۆر دەبێت دواتر زینای چاو ئاسان دەبێت. سەرەنجام ئەو ین و دڵداری و حەزلێکردن زۆر دەبێت و دوا جاریش زیناو داوێن پیسی بلاو دەبێتەوە، بە کورتی تێکەڵاو بوون و نەزەر کردن یەکەم هەنگاوی بەرەو زیناو داوین پیسی چوونە هەروەکو لە کۆنەوە وتراوە:

كُل الحواديث مبدءها مِن النَظَرِ ومَعظَمُهَم النار من مستصغر الشَرَرِ

واتە:هەمووئەو کەسانەی توشی ئابڕوو چون و داوێن پیسی دەبن، سەرەتاکەی لە تەماشا کردن و نەزەر کردنەوە دروست دەبێت، هەروەکو چۆن گەورەترین ئاگر لە پرنیشکێکی بچوکەوە دروست دەبێت، شاعیرێکی تر زۆر بەجوانی فەرمویەتی:

نَظَرَةٌ فابتسامةٌ فَسَلامُ            فَكلامٌ فَموعِدٌ فَلقِاءُ

واتـە: مرۆڤـ کـە توشـی زینـاو داوێـن پـیس دەبـێ، یەکـەم جـار لـەوەوە دەسـت پێـدەکات کـە کـوڕو کـچەکە تەماشـای یـەکتری دەکەن، دواتر شەرمیان لەیەکتری نامێنێت ئەنجا بە دەم یەکترەوە پێدەکەنن، پاشان هەرکات توشی یەکتری بوون سەلام لە یـەکتری دەکەنو ئـەحواڵ پرسـی و چاکو چۆنی لەگەڵ یەکتریـدا دەکـەن، پاشان مەو عیدو چاو پێکەوتن لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، کەواتـە ئەگــەر لەیەکــەمجار لــە تەماشــاکردنەکە خۆیــان بپــارێزن هەنگاوەکانی تری بە دوادا نایەت، بۆ یە پرسیار لە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـە وسـلم) کـرا، دەربـارەی چـاو پێکـەوتنی یەکــەمجار کــەپیاوێك چــاوی بــە ئافرەتێــك دەکــەوێت، یــان بەپێچەوانەوە ئافرەتێك چاوی بە پیاوێك دەکەوێ، کە ئەمە پێـی دەوتـرێ تەماشـا کردنـی کـتو پـڕ، پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیە وسلم) فەرمووی: ((أصرِف بَصَرَك)) [54] جاری یەکـەم ئەوە بە دەسی خۆت نەبوو ئافرەتێك هاتە بـەر چاوت، بـەڵام فـەرمووی لـە جـاری دووەم دا چـاوت دابخـەو بـەردەوام مەبە لەتەماشا کردنـی چـونکە زینـا لـە تەماشـا کردنـەوە دروسـت دەبێـت. لەبـەر ئـەوە مرۆڤی مو سڵمان دەبێ زۆر ئاگای لە خۆی بێ کە بەردەوام نـەبێ لە سەر نەزەر کردن چونکە ئەگەر لەیەکەم نەزەرەوە فریـای خـۆت نەکـەوی دەوروژێیـتو ئـەوەش ڕات دە کێـشێ بـۆ هـەنگاوەکانی

---

[54] رواه المسلم

تر، هەنگاوی یەکەمیش کە تەماشا کردن و نەزەر کردنەکەیە، ڕات دە کێشێ بۆ هەنگاوی دووەم کە زەردە خەنەو شەڕە چاوێکە، پاشانیش گفتوگۆو یەکتر بینینە، تا سەرەنجام کەوتنە ناو کارەساتی زینای لێ دەکەوێتەوە، هەربۆیە خوای گەورەکە باسی زینا دەکات نافەرموێ: زینا مەکەن، بەڵکو دەفەرموێ (( و لا تَقربُوا الزینا)) نزیکی زینا مەکەون، چونکە مرۆڤ ڕاستەو خۆ ناکەوێتە ناو زیناکەوە، بەڵکو زینا پێشەکی زۆرە، کە بەداخەوە ئەمڕۆ لەم وڵاتانەی ئێمەدا زیناو داوێن پیسی پێشەکی زۆری هەیە، کە واتە: پێویستە مرۆڤ لە یەکەم هەنگاودا تەوبەی لێ بکات، ئێستە کە حەز کردن لە ناخت دا هەیەو دە تەوێ پەیوەندی لە گەڵ ئافرەتێك دا یان ئافرەتێك لە گەڵ پیاوێك دا پەیدا بکات یان شەڕە چاوێکت گۆڕیوەتەوە لە گەڵ یە کێکی تردا، لە گەڵ ڕە فیقێکت دا یان هاو پۆلێکتدا، ئێستا تەوبەی لێ بکەوئەو پەیوەندیە بپچڕێنە و یەکسەر وازی لێبێنە، نەك بڵێی وردە وردە وازی لێدێنم و دوای تەرکی دەکەم نەك بڵێ ی بۆ یە من تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەما دەکەم تا خەڵکی وانەزانێ مرۆڤێکی وشك و دوا کەوتووم بەلاّم نەخێر بەوە پێش کەو توو نابی، ئەبێ ئەوەی لاتۆ گرنگ بێت سەلامەتی دینەکەت بێ، چونکە ئێمەی موسڵمان لە قورئانەکەمانەوە چاکەو خراپە لە یەکتری جیا دەکەینەوە دینەکەمان پێمان دەڵێ کامە حەرامەو کامە حەلاڵە کامە باشەو کامە خراپە، زۆر بە داخەوە خەڵکانێك

هەیـــە لـــە ســـەر ڕووپـــەڕی ڕۆژنامـــەو گۆڤـــارو شاشـــەی تلفیزیۆنەکانـەوە بـە ڕاشـکاوی دەڵـێ ئێمـە بۆیـە دواکـەوتوین خـەتای دینــی ئیـسلامە و ئـەمریکاو ئـەوروپاش بـۆ یـە پـێش کـەوتوون چـونکە ئافرەتیـان ڕووت و قوتـەو وازیـان لـە دین و لـە هـەموو پیرۆزیـەکانی ئـەخلاقی و ئینسانی هینـاوە، بۆیـە ئێستە کۆمەڵگەیـەکی ئاسـودەو بـە ختـەوەرن بێجگـە لـەوەش بونەتـە شوێنێك بۆ ئەوەی وولاّتانی تری دونیا شوێن هەنگاوە کانیان بکەون و واز لە هـەموو پیرۆزیە ئـەخلاقی و دینی یەکانی خۆیـان بێنن، بەلاّم بێ ئاگایە لە مێژوی ئەو رووپا کە هـەر نزیکـەی دوو سەد ساڵێك لەمەو بەر، هـەر لەو ئەوروپایە ئافرە تیان دەرپێی ئاسـنیان لـە پێـدەکرا بـە تایبـەتی کـاتێ کـە دەیـان ویـست سەفەرێکی چەند مانگی بکەن، لەلایەن مێردەکانیشیانەوە قفڵ لە دەرپێی ئاسنەکەیان دەدراو کلیلە کەیان لە گەڵ خۆیان دەبرد لـە ترسی ئەوەی ژنەکانیان خیانەتی هاوسەری یان لێ نەکەن!!لە هەموو مێژوی ئیسلاما شتێکی ئاوانیە؟ کام پیاو دڵی زۆر پیسە شـتی وای بەرامبـەر ژنەکـەی نـەکردووە! وە ئـەو کەسانەشـی کـە وادەزانـێ پـێش کەوتنـە تەکنـەلۆجی و زانستیەکەیەی ئـەوروپا، هـی ئەوەیـە کـە بـێ ڕەوشـتی تێـدا ئـازادە، ئەوانـەی زۆر نـە خوێنـدەوارو نـەزان و ساویلکەن؟! ئەوانـە خـەڵکانی زۆر لاسایی کەرن، هـەربۆ یـە دەبینـی زۆرێك لەوانەوەی کـە دەچنـە ئـەوروپاو ئەمریکا و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ولاّتی خۆیان بە داخـەوە هـەموو

دیاریـەکیان بـۆ ئـەم ولاتـە وێرانـەو میللەتـە چـەو ساوە مەزڵومـە بریتـی یـە لـە نـاردنی شـریتێکی فیـدیۆی کـە گـۆرانی بێـژێکی ئـافرەت ڕەقـس و سـەما بکـات و نـاوکی بـەدەرەوە بێـت!! بـۆ بـەیانیش خـەڵکانێکی بـێ دیـن و دیـن لاواز لاسـای دەکاتـەوە، دواتریش بە پێش کەوتنی دەزانێ دەیکات بە مۆدێل لـە بازاڕدا، بە بێ ئەوەی سەرچاوەی ئەم مۆدێل بازیە بزانێ لە کوێ وە هاتووە هـەروەك و دکتـۆر کەمال مەزهـەر لە کتێبـی مێـژوودا دە یگێڕێتـەوە و دەڵێت لەسەر دەمی لویسی چوارم دا، شـەوێکیان لـە کۆشـکی پاشا ئاهـەنگێك دەبـێ، لـەو کاتـەدا نـاو هـۆڵی کۆشـك جمـەدێت و هـەموو خەڵکی چاوەڕوانی پاشا دەکەن و دەیانـەوێت بزانن چی لەبەردایـە، بەلاّم پـێش هاتنی پاشا بۆ ناو کۆشك، دەبێتـە باران و ئیتر مـەرای کـەران و ماستاوچـیـەکان دەکەونـە هەلەکەسـەما نـەوەك و جـەنابی خاوەن شکۆ بارانی بەرکەوێ، بۆ یە یـەکێك پـەلاماری چـەتر دەدات یەکێکی تر خاولی و یـەکێکی تر گولاّو، ژمارەیەکیشیان پانتۆڵەکەی بـەڕێکی بـۆ هـەڵ دەکـەن بـۆ ئـەوەی پریـشکی قـوڕو چڵ پـاو بـەر پانتۆڵەکەی خاوەن شکۆ نەکەوێ، کە دەگەنە ناو کۆشکی پاشایەتی ئەوانەی کە پانتۆڵەکەیان بۆ هەڵکردووە، بیریان دەچێت پانتۆڵەکەی بۆ دادەنەوە دوایش کە لە ناو ئاپۆرای جەماوەردا بیریان دەکەوێتەوە پیان عەیبە تازە لە بەرچاوی ئەو خەڵکە پاشا ڕاگرن و پانتۆڵەکەی بۆ وەك خۆی لێکەنەوە، ئیتر خەڵکی دەکەونە مقۆ مقۆو دەڵێن:

بە خو؛ پاشا مۆدێلێکی تازەی لە بەرایە، هەربۆیە بۆ ڕۆژی دوای هەریەکە لەو خەڵکە ڕوو دەکاتە بـەرگ درووی یـەك تـا دەستوبرد

پانتۆڵێکی کوڵی قەراغ هەڵکراوی وەك پانتۆڵەکەی دوێنێ شەوی پاشای بۆ بدورێت........ ئیتر ئەمە بوبە مۆدو هەر ئەو مۆدەیەی کەس نەیزانی چۆن پەیدابوو، هیتلەر بەو هەمو زەبرو زەنگەی بۆ لە ناو نەبرا.

خۆشەویستان ئەوانەی کە دەڵێن: ئەوروپا بە هەشتی سەرزەویە بێ ئاگان لەوەی کەساڵی (١٣٤٧) تا ساڵی (١٣٥٠) زاینی تاعونێك لەو ئەو روپایەدا بڵاو بۆوە، هەشتا ملیۆن مرۆڤی کوشت، ڕۆژی هەشت سەد کەس تەنها لە پاریس پایتەختی فەرەنسا دەمرد. مەشهورە بەوەی کە (⅓) ی ئەوروپا فەوتا!! دە ولاهی ئێستاش نەخۆشی ئایدز لەو تاعونەی ئەو کاتە مەترسی زیاترە نەك تەنها لەسەر ئەو روپا بەڵکو لەسەر ئەمریکاو ئەفەریقاو هەموو دونیاش. خوێنەرانی بەڕێز دەزانی ئایدز چیەو کەی ئەم نەخۆشیە ترسناکە سەری هەڵدا، ئایدز ( AIDS ) بریتیە لە کورت کراوەی پیتەکانی ( Acquired Immune Sefieinsy Syndrome ) واتە ئەم ئایدزە بریتیە لە دوو پێکهاتەی سادە کە دە چێتە ناو خڕۆکەی سپی خوێنەوە، خڕۆکەی سپیش دوو جۆرن لە ناو خوێندا، وە ختێك مرۆڤێك شوێنێکی برین دار دەبێ، یەکسەر کۆمەڵێك میکرۆب ڕوو دەکەنە شوێنی ئەو برینە، لەو کاتە دا کۆمەڵێك خڕۆکەی سپی دێن وەکو پێشمەرگەی فیداکار بۆ ئەوەی ئەو میکرۆبە لە ناو بەرێ، ئەو کۆمەڵە خڕۆکە سپیە ئەوە پێشمەرگە کانی ئەوەڵن، دەستەی یەکەمن و دێنە پێشەوە بۆ

دیفاع،ئەی ئەو خڕۆکە سپیانە چیان لەسەرە؟! ئیشیان ئەوەیە بەرگری لەو میکرۆبانە دەکەن کە لەڕێگای ئەو برینەوە دەیەوێت بێتە ناو لەشی مرۆڤەکەوە. پاش ئەوەی خڕۆکە سپیەکان خێرا دەچنە بەردەمی برینەکەو نایەڵێ میکرۆب بێتە ناو لەشی مرۆڤەکەوە، یەکسەر بەدوای خڕۆکە سپیەکەشەوە خەپلەیەکی گەورە تر دێن و لە دەمی برینەکەدا میکرۆبەکە دەکوژن. لەم کاتەشدا ڤایرۆسی ئایدز خۆی دەدزێتەوە و دە چێ لەناو خڕۆکە سپیەکاندا گەرا دا دەنێ بە شێوەیك کەسی نەخۆش تاماوەی حەوت ساڵ بۆ دەساڵ هەست بەوە ناکات نە خۆشی ئایدز لە لەشیایەتی هەتا وای لێدێت هەموو خانەکانی لەشی ئەم مرۆڤە توشی دەبێ ئەگەر بە قەبارەی شوێنی نوکە قەڵەمێك وەرگرین لە لەشی نەخۆشەکە کە شوێنی یەك نوکە قەڵەم زۆر بچوکە، تەسەورکە ئەو شوێنە یەك ملیۆن ڤایرۆسی ئایدزی تێدایە، سبحان الله ئەم کەسەی ڤایرۆسەکەی هەڵ گرتووە، هەر بە خۆشی نازانێ کە هەڵی گرتووە چونکە هیچ شوێنەوارێکی لە سەرلاشەی نەخۆشەکە بە جێ نە هێشتووە بەڵام کاتێ کە لێی دەرکەوت لە ماوەی شانزە مانگدا یان لەماوەی دوو بۆ سێ ساڵدا یان لە ماوەی پێنج ساڵدا زۆر بە زەلیلی دەیکوژێ.

بەڕێزان: ئەم نەخۆشی ئایدزە، لە ڕیگای زیناو داوێن پیسیەوە توشی مرۆڤ دەبێت، یان لە ڕیگای چونە لای ئافرەت لە پشتەوە، یان بە هۆی نێر بازیەوە توشی مرۆڤ دەبێت، سەر چاوە مێژوییە کان

دەڵێن: یەکەم جار ئەم نەخۆشیە لە ساڵی (١٩٧٩) دا یەکەم حاڵەتی لە ئەمریکا دۆزرایەوە واتە لە هەموو جیهاندا یەك کەس توش بووبوو، دوای ساڵێك واتە ساڵی (١٩٨٠) بو بە شەست کەس لە ساڵی (١٩٨١) ژماری ئەو کەسانەی توشی نەخۆشی ئایدز بوون بوو بە هەشتاو یەك هەزار و چوار سەدو سی و سیٰ کەس. هەر لەو ساڵە دا ئەمریکا ڕایگەیان لە وڵاتەکەیدا، پەنجاو نۆ هەزارو شەست و نۆ کەس توشی بووە، تە ماشاکە چەند بە خێرای بلاٌو دەبێتەوە بە جۆریٰ لە ماوەی یەك ساڵدا لە ئەمریکا لە شەست کەسەوە بۆوە بە هەشتاو یەك هەزارو چوارسەدو سی و سیٰ کەس!!

فەرموون ئێستا با بزانین ئەم نەخۆشیە بە هۆی چیەوە دە گوازرێتەوە لە کەسێکی توش بووەوە بۆ کەسێکی تر؟! لە م ڕێگایانەی خوارەوە کە باسیان دەکەین

**یەکەم:** جوت بونی ژن‌و پیاو یان پیاو وپیاو کە یەکێکیان هەڵگری ڤایرۆسی ئایدز بێت، ئێستا (ئیسرائیل) ئەو ئافرەتانەی کە توشی ئایدز بوون بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەی خۆی، وەك‌و چەکێکی کوشندە دەیان نێریٰ بۆ سەر وڵاتانی تر بە تایبەتی وڵاتانی ئیسلامی‌و دەوروبەری لە جیاتی تۆپ‌و تەیارە و چەکی کۆ کوژ ئافرەتێکی داوێن پیسی توش بوو بە ئایدز دە نێرێتە ئەو وڵاتەی ڕقی لێیەتی، بۆ ئەوەی لە ڕێگای زیناوە بە سەدان خەڵك لە ناوبەریٰ. چونکە هەر بەیەك جار زینا کردن لە گەڵ کەسێکی توش بوودا، کە سە توش نەبوەکان توش دەبیٰ، هەر بۆنمونە ئافرەتێکی گەڕۆکی ئیسرائیلی، لە ئەسکەندەریەی میصر، چاو لە گەنجێکی میصری دا

دەگریٚ و دەیباتەوە بۆ ئوتێلەکەی‌و شەو لەگەڵی دا جوت دەبێت، بە یانی زو ئافرەتەکە کارتێکی بۆ بە جێدێڵێ و لای پشتیەکەی ژێر سەری یەوە بۆی دادەنیٚ، کە لێی نوسراوە ( أهلاً و سهلاً في نادي الآيدز العالمي ) ئەوە جەنابیشت بوی بە ئەندامی یانەی ئایدزی جیهانی! ئیتر کورە تا زە لە ناو چوو، ژیانی کۆتای هات، دەبیٚ بۆ خۆی هەر قوڕ بپێویٚ

**دووەم:** دووەم ڕێگا بۆ گواستنەوەی ئایدز، لە ڕێگای ماچ کردن‌و لیکی دەمی نەخۆشەکەوەیە! تەنها بەیەك ماچ کردن، یان تێکەڵاو بوونی لیکی ناو دەمی نەخۆشەکە، مرۆڤە توش نەبووەکەش توش دەبیٚ، با زیناشی لە گەڵا نەکردبیٚ.

**سێیەم:** بەهۆی بە کار هێنای دەرزیەوە، ئەو یش بەهۆی ئەو کەسانەی کە مادە بیٚ هۆشکەرەکان (المُخدّرات) بە کاردێنن توشی حاڵەتێکی نەفسی وادەبن کە دەرزیەك دەکڕیٚ لە وانەیە چەند کەس پێشتر هەر بەو دەرزی یە لە خۆیان دابیٚ، جا ئەگەر ئەکێك لەو کەسانە نەخۆشی ئایدزی لە گەڵ بووبیٚ، کە دەرزیەکە چووە لە شیەوە یەك سەرە دەرزی، یەك ملیۆن ڤایرۆس دە گوازێتەوە!!کاتیٚ لە کەسێکی تری ساغ درا ئەوە بەیەك جار یەك ملیۆن ڤایرۆسی ئایدز دە چێتە لە شیەوەو توشی دەبیٚ لە سەدا (١٢-٢٠)ی توش بوون بە ئایدز بە هۆی بەکار هێنانی دەرزی مادە بێهۆش کەرەکانەوەیە.

**چوارەم:** بۆ گواستنەوەی ڤایرۆسی ئایدز، لە ڕێگەی تێکردنی خوێنەوەیە کە یەك ملیم خوێن دەتوانیٚ سەد هەزار ڤایرۆسی ئایدز بگوازێتەوە بۆ یەکێکی تر . لە ساڵی ١٩٨٦ دا لە سعودیە،

منداڵێکی شەشساڵان کە پێویستی بە خوێن بوو، خوێنیان تێکرد، کە خوێنەکە لەشاری (سانفرانسیسکۆ)ی ئەمریکاوە هاتبوو، منداڵەکە لەو خوێنەوە توشی ئایدز بوو، چونکە ئەو کەسەی خوێنەکەی لێگیرابوو نەخۆشی ئایدزی هەبوو. پاشان لە ساڵی(١٩٨٩) دا دوو کەسی تر هەر لە ڕێگای تێکردنی خوێنەوە توش بوون، کە یە کێکیان نەشتەرگەری گورچیلەی بۆ کرابوو، ئەوی تریشیان نەشتەر گەری سیەکانی، وە ختێ خوێنیان تێکرد توشی ئایدز کە بوو، چونکە خاوەنی هەردوو خوێنەکەی هەڵگری ڤایرۆسی ئایدز بوون، لە سەدا (٢-٤)ی توش بوون بە هۆی خوێنەوەیە.

خۆشەو یستان لە مانگی دەی ساڵی (١٩٩٧) دا کۆنگرەی چوارەمی نێو دەوڵەتی بۆ بەرگری کردن لە بڵاو بونەوەی ئایدز لە شاری (مانێلا) ی پایتەختی ( فلیپین) بەسترا، کە لەو کۆنگرەیەدا سێ هەزا پسپۆڕی شارەزا لە (٦٥) وڵاتی جیهانەوە بە شداریان تێدا کرد، کە لە کۆتای کۆنگرە کەدا بە ڕێوە بەری کۆنگرەکە کە ناوی ( بیکەر بیوت) بوو، کە نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان بوو لە کۆنگرە کەدا ڕای گە یاندا کە : ژمارەی توش بوان بە نەخۆشی ئایدز لە ساڵی ١٩٩٦ دا گەیشتۆتە بیستو سێ ملیۆن کەس!! کە چواردە ملیۆنی تەنها لە باشوری بیابانی ئەفریقا دا بوو حەوت ملیۆنیشی لە ئاسیادابووە، کە پێنج ملیۆن تەنها لە (هندا) دەر کەوتووە. وە سەرۆکی کۆنگرە

كە داوای كرد كە ڕێو شوێنی توندو تۆڵ بگرێتە بەر بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی ئایدز لە ئاسیادا، كە ووتی: توش بوون بە ئایدز لە ئاسیادا دە توانرێ ناوو ببرێ بە ( الكارثة التأريخية للآسيويين) كارەساتی مێژووی بۆ ئاسیاییەكان هەروەها لە كۆنگرە كەدا ڕاگەیەنرا كە هەڵگرانی میكرۆبی ئایدز لە ناو منداڵاندا لە كۆتای ساڵی (١٩٩٧) دا گەیسشتە یەك ملیۆن منداڵ!! یەك ملیۆن منداڵی بێتاوان لە سەرەتای بەهاری ژیانیاندا، گوڵی ژیانیان هەڵ دەوەرێ، بە هۆی چیەوە؟بەهۆی زیناوە لەسەدا (٩٠) ئەو منداڵانەی كە توشی ئایدز دەبن بە هۆی دایكە كانیانەوەیە، ئەو ڤایرۆسی ئایدزە لە ڕێگای دایكەوە دە گوازرێتەو بۆ منداڵە كانیان لە كاتێكدا لە ناو سكی دایكی دایە، یان لەكاتی لە دایك بوون دا لەڕێگەی خوێنەوە یان لە ڕێگەی شیر پێدانەوە منداڵەكە لە دایكیەوە ئایدزەكەی توش دەبێت.

بەڕێزان: ئەوەی زیاتر مەترسی نەخۆشی ئایدز دەر دەخات ئەوەیە كە ئەوەندە زوو دەگواسترێتەوە كەس ناتوانێ لە كەسی توش بوو نزیك بێتەوە، تەنانەت دوای مردنی ئەو كەسانەی بەر پرسن لە شاردنەوەی مردوو دەستی لێنادەن، پزیشكە كان دەست كێش لە دەست دەكەن لە كاتی چارە سەرداو دوای لێبوونەوە دەست كێشەكان دەسوتێن! هەروەها ئایدز دەردێكە كە چارە سەركردنی یەك نەخۆش (پەنجا بۆ سەد) هەزار دۆلاری

ئەمریکی دەوێت، درێژترین تەمەنی ئەو نەخۆشیەش دوای توش بوون (٢-٣) ساڵە.

کەواتە: هەروەكو ژیانی کەسەکە لە ناو دەبات سەروەت و سامانی نەك خۆی بەڵکو بنەماڵەو حکومەتەکەش لە ناو دەبات! هەر بۆیە مرۆڤی دڵسۆز بە خۆی و کۆمەڵگاکەی و حکومەتەکەی و گەل و وڵاتەکەی، ئەو کەسەیە کە داوێن پاکە، نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو وەك و خۆی داوێن پاکە، هەوڵیش ئەدا کە خەڵکانی تریش هەموویان داوێن پاك بن، وە هەموو مرۆڤەکان لە بەد ڕەوشتی و زیناوە دوربن، لەبەر ئەوەی ئەگەر هەندێ خەڵکی حاڵی نەبوو لە دین و ژین دەڵێ خۆ کەس ناچێتە قەبری کەسەوە، بزن بە پێی خۆی هەڵ دەواسریو، مەڕ بە پێی خۆی، واتە: خۆت چاك و پاك بەو حەقی کەست نەبێ، بەڵام ئەی ئەوە چی لێدەکەن کە وەکو باسمان کرد بە ملیۆن خەڵکی بێ ئاگا، یان بێ تاوان وەك و منداڵ، بەهۆی چەند کەسێکی داوێن پیس و بێ دینەوە توشی ئایدز دەبن! ئاخر ئەمانە هەر لەدونیادا خەڵکی دەخەنە ئەو قەبرەوەی کە خۆیان تێی چون!

هەروەها زیناو داوێن پیسی جگە لە ئایدز نەخۆشی یە کۆنەکانی تریشی پێوەیە:

**یەکەم: نەخۆشی زەهری( السفلس ):-**

ئەم نەخۆشیە نەخۆشیەکی ساریەو لە ئەنجامی کاری جوت بوونی ناشەرعیەوە سەری هەڵ دەدات، ئەم نەخۆشیە ڕاستەو خۆ دەر ناکەوێ بەڵکو بە چەند قۆناغێك دەر دەکەوێت و لە ناو لەشی مرۆڤدا بڵاو دەبێتەوە، سەرەتا لە شێوەی چەند زیپکەیەك لەسەر پێستی مرۆڤەکە پەیدا دەبێت و بە تایبەتی لەسەر کیسی گونو هەروەها بەدەوری کۆمو بە دەوری دەم دا دەر دەکەوێت، مەترسی ئەم نەخۆشیەش ئەوەیە بە خێرای بە هەموو ئەندامەکانی لەش دا بڵاو دەبێتەوە وە ئەگەر لە قۆناغی سەرەتای و یەکەم دا دەست نیشان نەکرێت، لەپڕ تەشەنە دەکات و بڵاو دەبێتەوە، دواتر بە خێرای خۆی دەگەیەنێتە جگەرو دە ئاوسێ و دەبێتە هۆی نەخۆشی شێر پەنجە و دواتریش پەل دەهاوێت بۆ برِبڕەی پشتو دەبێتە ئەگەری ئیفلیجی، هەروەها ئەم نەخۆشیە پەل دەهاوێت بۆ دەمارەکانو بۆ سیەکانو دڵ، لە کۆتایدا ئەو مرۆڤانەی توشی ئەم جۆرە نەخۆشیە دەبن شێوەیان دەگۆڕێو سەرەنجام گیان لە دەست دەدەنو دەمرن، ئێستا زیاتر لە پەنجا ملیۆن کەس لە جیهان دا توشی ئەم نەخۆشیە بوون.

**دووەم: نەخۆشی سەیلان (السّیلان):-**

ئەم نەخۆشیەش وەکو جۆرەکەی پێشوو ساریە واتە: زۆر زوو لەکەسی نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی ساغ، ئەم

نەخۆشـیە زۆر زوو لـە نـاو داوێـن پیس‌وزینـا کەرەکانـدا بـڵاو دەبێتەوە، بە شێوەیەك هەندێ لە زانایان‌و پزیشکە دیارەکانی جیهـان پێـی دەڵێـبن نەخۆشـی دووبـارە (الـردە) چـونکە ئـەم نەخۆشیە دوبارەو سێبارەو چەند بارە دەبێتـەوە لـەو کەسانەی کە بەردەوامن لەسەر ئەم کاری زیناو داوێن پیسی یە، وە خـوای گەورە ودڵ‌و سزایەکی خوای‌و ئاسمانی ئەم نەخۆشیە توشی کۆ ئەنـدامی میـزوو زاو زێ ی ژن و پیـاو دەکـات. لــە وانیــشەوە ڤایرۆسـەکە دەگوازرێتـەوە لـە کەسـێکی تـوش بـوو بـۆ کەسـێکی ساغ، لە ڕێگای نێر بازیـەوە (اللـواط)ە دە گوازرێتـەوە و لەکاتی زینـا کـردنیش دا دە گوازرێتــەوە بـۆ ئـافرەت لـەو یـشەوە بـۆ کەسێکی تری زیناکەر دە گوازرێتـەوە، ئـەم نەخۆشـیە لـە ئافرەت دا دەر ناکـەوێت واتـە: ئافرەت زوو هەسـتی پێناکـات ئەمـەش بـە هۆی پێك هاتەی جەستەی ئافرەتەوە بە هۆی حاڵەتی بێنوێژی‌و دەرهاویـشتەکانی زێ و دەرگــای ڕەحمــەوە، بــەڵام پیــاو زوو هەستی پێدەکات، پە نابەخوا ئـەو پیاوەی توشـی ئـەم نەخۆشیە بێـت زوو هەسـت بـە سوتانەوەی ئەنـدامی نێرینـەی دەکـات کـە بـۆنێکی زۆر ناخۆشــی هەیـە، وەئەگـەر بـەزووی ئـەم نەخۆشـیە چـارە سـەر نـەکرێت و ئـەو کەسـە تەوبـە نـەکات و واز لـەو کـارە حەرامەکە نەهێنێ، بەخێرای نەخۆشـەکە زاو زێ دەکات‌و پاشـان دەگوازرێتـەوە بـۆ بۆریـەکانی میـزو میزەڵدان‌و کۆ ئەنـدامی زاوو زێ ی، کـە لەوانەیـە نەخۆشـیەکە پێویـستی بەچـەندین نەشـتەر

گـەری هـەبێت کـە ئەگـەر بـەناو بـانگترین و پیـشکەوتوو تـرین نەخۆشخانەی پێشکەوتو ترین ولاتـی ئـەم جیهانـەی بۆ بکرێـت و سـەرکەوتنیش بـە دەسـت نـەهێنیٚ. سـەرە ڕای ئـەوەش ئـەو منداڵەی لەو پیاوە دروست دەبێت توشی ئەو نەخۆشیە دەبێـت، هەروەها ئەم نەخۆشیە توشی هێلکەدان و ڕەحمی ئافرەت دەبێت و پاشـانیش دەبێتـە هـۆی نـەزۆکی ئافرەتـە تـوش بووەکـە، دواتریش توشی چەندین نەخۆشـی تری جۆراو جۆر دەبێـت بە جۆریٚ ئەگەر نەخۆشەکە بە زووی واز نەهێنیٚ و چارە سەری بۆ نـەکریٚ دەمـریٚ، ئـەم نەخۆشـیە زۆر بـلاوە لـە جیهانـداو سـالانە (٨٠-٢٠٠) بلیـۆن دۆلاری دەویٚ بـۆ چـارە سـەرکردنی، سـالانە (٢٥٠) ملیۆن کەس توشی ئەم نەخۆشیە دەبن!.

**سێیەم :هەربز (هربز جینتا لس) یان ( هربس الجنسی ):-**

ئەم نەخۆشیە لەڕێگای زیناو نێربازیەوە بلاو دەبێتەوە و یەکێکە لەو نەخۆشیانەی لـە ڕێگـەی جوت بونی ناشەرعی یەوە پـەیدا دەبێت بەتایبـەتی  توشی کۆ ئەندامی زاوزیٚ و ئەنـدامی نێرینـە دەبێـت لـە پیـاو داو توشـی زیٚ و دەرگـای ڕەحمـیش دەبێـت لەئافەرت دا واتە: بەشێوەیەکی تایبـەتی لـە سـەر کۆئەنـدامی زاو زێـی نێرینـە و مێـی ینـە دەبێت و ئـازارێکی زۆری هەیـە، ئێـستا زیاتر لە (٢٠) ملیۆن کەس توش بووە بەم نەخۆشیە، کە تەنها لـە ولاتە یەگرتوە کانی ئەمریکا سالانە نیوملیۆن کەس زیاد دەکات.

خۆشەویستان ئەوەی رێگری لەو لافاوی فەسادە دەگرێ و دە مان پارێزێت تەنها دینی پیرۆزی ئیسلامە، وە هیچ چارە سەرێکیش نیە لە ئیسلام دا تەنها خۆپاراستنە لە کاری زیناو داوێن پیسی وەك و وتراوە (الوقايةُ خيرٌ مِن العلاج ) خۆ پاراستن باشترین چارە سەرە! یا (درهمٌ في الوقاية، خير من قنطارٍ في العلاج ) مرۆڤ ئەگەر بتوانێ بە (١٠٠) دینار خۆی بپارێزێ، باشترە لەوەی کە دوای دەهەزار دینار بداتەوە بە چارە سەرکردن. کەواتە: پێویستە هەمووومان شانازی بەدینەکەمانەوە بکەین کە دینی تەندروستیە دینی پاکی و بێ گەردییە دینی علم و پێشکەوتنە وە پێویستە ترسی خوا لە دڵماندا بێت و لە هەموو کارو کردەوەیەکی بەد ڕەوشتی و داوێن پیسی دورکەوینەوەو دەستی نزاو پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار بەرزکەینەوە کە خۆمان و ماڵ و منداڵ و میللەت و مرۆڤایەتی بپارێزێت.

# بەشی حەوتەم

## جنــس

### یەکەم: جنس لەڕوانگەی علمانیەتەوە

سەرەتا حەزدەکەم جنس لە دیدو بۆ چونی فرۆیدەوە باس بکەم هەروەکو مامۆستا مەلا أحمد شارەزووری( ڕەحمەتیخوای لێبێت ) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی(فرۆید لە تەرازووی ژیری )دا، ڕەچاوی کردووە، بەجۆرێك کە فرۆید هەموو ژیانی خۆی بۆ جنس تەرخان کردبوو، سەرەڕای ئەوەش فرۆید پێشەواو پێشەنگی علمانیەتە، کە ئالأی جنسی بەدەستەوە گرت بوو بۆ گەیاندنی پەیامەکەی کە پەیمانی علمانیەت بوو بە هەموو جیهان. فرۆید دیدو بۆچونی وایە کە جنس سەرچاوەی بیرکردنەوەی مرۆڤە، سەرلەبەری ژیانیشی داپۆشیوە بۆیە فرۆید پێی وایە هەرچی پێش کەوتنی بواری سیاسی و ئابوری و هونەری و ئەدەبی و ڕۆشنبیری یە بەرهەمی جنسن، فرۆید بۆچونی وایە مرۆڤ هەر لەوکاتەی کە چاوی بەدنیا هەڵ هێناوە و دێتە سەر ئەم زەوی یە جنس لەگەڵیدا تواوەتەوە، بەجۆرێك چۆن منداڵ هەست بە برسێتی سکی دەکات، ئاواش هەست بە برسێتی ئارەزوەکانی دەکات ، لەبەر ئەوەیە کە فرۆید بەو پەڕی دڵنیای خۆیەوە دەڵێ: کاتێ کەکوڕ مەمکی دایکی دەمژێت،

هەڵپەی بۆ شیرەکەی نیە، ئەوەندەی هەڵپەی بۆ دامرکاندنەوەی لایەنی جنسی یەکەیەتی، زیاتر لەسەر قسە نازانستی یەکانی دەڕواو دەڵێ کاتێ کە منداڵ خۆی دەلکێنێ بەسنگ و ئامێزی دایکی یەوە خۆنوساندنەکەی هۆکارێکی جنسیە نەك برسێتی ( سبحان الله ) لەم فکرە نازانستی و شێگانیە ، بە کوردی خۆمان پێتانی ڕابگەیەنم و لێتان نەشارمەوە ، فرۆید دەیەوێ پێمان بڵێ کور هەر لەسەرەتای لە دایك بوونیەوە ، حەزی لە دایکیەتی ، بەڵام باوکی لێی داگیر کردووە و ڕێگرە لەبەردەمی بەهەمان شێوەی کوڕەکەش کچیش حەز لە باوکی دەکات بەڵام دایکی ڕێگرە لەبەردەمی داو لیَ ی داگیر کردووە پەنا بەخوا ئەم بیرو بۆ چونە زۆر دوورە لەهەموو پێوەرێکی دینی و زانستی یەوە لەگەڵ فگرەتی سلیمی إنسان دا ناگونجێ ، دەتوانین بە نمونەیەکی زۆر سادەو ساکاری خۆمان وەڵامی ئەم چەواشەکاری یەی فرۆید و هەوادارانی بدەینەوە و بڵێین باشە وا بڕوامان کرد کە کوڕ لەبەر حەزو ئارەزوی جنسی مەمکی دایکی دەمژێت بەڵام ئەی کچ بۆچی ؟! لەوەش زیاتر فرۆید درێژە بە قسە نازانستی یەکانی دەدات و دەڵێت پێویستە لەسەر دایکان و باوکان کە زۆر گەمەو یاری لەگەڵ منداڵەکانیان نەکەن ، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی زوو پێگەیشتنی حەزو ئارەزوی جنسی ، لێرەوە جارێکە فرۆید دەیەوێت بە تەواوی شیرازەی خێزان لێکهەڵ بوەشێنێ کە بەردی بناغەی کۆمەڵگەیە هەروەها فرۆید چۆن

لای وایە کوڕ و کچ حەز لە ددایك و باوکیان دەکەن ئاواش دایك و باوك حەز لە کوڕو کچی خۆیان دەکەن ، هەر لەبەر ئەوەیە کاتێ کە دایك کوڕە کۆرپەکەی لەباوەش دەگرێ و بە سنگ و ئامێزی خۆیەوە دەنێ و دەیگوشێ ئەو لەحەزوو ئارەزووی جنسی یەوەیە نەك لە سۆزو خۆشەویستی جگەرگۆشەیی یەوە، هەروەها دەڵێ باوکەکەش بەهەمان شێوە کە کچە بچکۆلانەکەی خۆی ماچ دەکاو لە باوەشی دەگرێ کەواتە علمانیەت لە هەرکات و زەمینە و سەردەمێکدا بێ بە بیانوی پڕوپوچ و دوور لە زانستی یەوە ، دەیەوێ ئەخلاق و بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی بشێوێنێ و لە ڕێڕەوی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی خۆی لایدا کە خزمەت کردنە مرۆڤایەتی خزمەت کردنی زیاترە بە ئاوەدان کردنەوەی وولات و سەرزەوی ، بۆ خزمەت کردن بە دینی خوا ، بۆیە لە بۆچوونی عەلمانیەتەوە ژن و پیاو هەر چەند زیاناکارو داوێن پیس بن پێیان ناوترێ زیناکار و داوێن پیس ، تاوەکو لەم ڕێگا چەوتەوە ئیسلامی جوان ناشرین بکەن و مسوڵمان لە ڕاستە شەقامی ئیسلامی و گۆڕینی بیروباوەڕی مسوڵمان لابدەن هەوڵی بە علمانی کردنی ڕژێمە فەرمان ڕەواکانی جیهان و وولاتانی ئیسلامی بە تایبەتی بگرنەبەر . بۆیە پێم خۆشە لەم بەشەی دواترمان دا باسی جنس بکەین لە ڕوانگەی ئیسلامەوە .

## دووەم: جنس لەڕوانگەی ئیسلامەوە:

لەڕاستیدا ئەم باسەم واتە: (جنس) م بۆیە لەم بەشەی کۆتای کتێبەکەما هەڵبژارد، چونکە زۆر کەس وا دەزانیٚ جل و بەرگی شەرعی کە خوای پەروەردگار لەسەر ئافرەتی ئیمانداری فەرزکردووە، مەبەستی نەهێشتنی، حەزو ئارەزووی جنس یە، بەلاّم بە پشتیوانی خوا ئێستا ڕوونی دەکەمەوە کە بە هیچ شێوەیەك خوای گەورە مەبەستی ئەوە نیە. بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئیسلام وەکو دینێکی ئاسمانی دەستکاری نەکراو وەکو ئاخر پەیامی خوا هاتووە غەریزەی جنسی و سەرجەم بوارەکانی تری کۆمەڵگا ڕێك بخات و لە هەموو شێوازێکی نازانستی و ناڕاستی دوور بخاتەوە، تاوەکو لەو ڕێگایەوە کۆمەڵگە بەرەو فەسادو لێك ترازان نەڕوات، چونکە مێژوو ئەو ڕاستیەی بۆ سەلماندووین، کە چەندین میللەت و حەچارەت لە ناوچوون و فەوتاون، بەهۆی خراپ بەکارهێنانی جنس و ئارەزووە سێکسی یەکان بەشێوازێکی ناڕێك وپێك . بۆیە خوای گەورە کە خولقێنەری مرۆڤایەتی یە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمویٚ مرۆڤ خاوەنی کۆمەڵیٚ غەریزەیە، خاوەنی کۆمەڵیٚ غەریزەی سروشتی یە لە ناخی خۆیدا و ئەو غەریزانەش شیرین کراون لەبەرچاوی هەموو کەسێکدا، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەم ڕاستیە دەکات و دەفەرموێت: ﴿زين للناس حبُّ الشهوات مِنَ النساء والبنين والقنطر المقنطرة من

الذهب والفضة والخيل المسوَّمةِ والحرث والأنعام ذلك حياة متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن المآب ﴾[55] خوای پەروەردگار ئەم شتانەی لەبەرچاوی إنسان جوان کردووە، واتە إنسانی والێکردووە هەوڵیان بۆ بدات و تێکۆشانیان بۆ بکات و لە ڕێگەیەکی شەرعی و جوانەوە هەقی خۆیان پێ بدات

یەکەم: ئافرەت واتە: خێزان بەنسبەت ئافرەتیشەوە پیاو. ئەمە غەریزەیەکەو خوای گەورە لەناو ناخی إنسان دا ڕواندویەتی. هەر لەگەڵ باڵغ بوون و جوڵانی غەریزەی جنسی دا،مرۆڤ عەودالی دەبێت و هەوڵی دەست کەوتنیان دەدات .

دووەم: بونی ئەولادی باش و صالح

سێیەم: بونی زێڕو زیو واتە دینارو دۆلار .

چوارەم: (والخيل المسومه) بوونی وەسائیلی هاتووچۆو سەیارەی باش .

پێنجەم: (( والأنعام والحرث )) بوونی مەڕو ماڵات و زراعەت و فەلاحەت .

خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەمانەم لەبەرچاوی إنسان شیرین کردووە ( ذلك الحياة الدنيا ) ئەمانە خۆشی ژیانن، واتە حەرام نیە إنسان ئەمانەی هەبێ جا إنسان کە ئەمانەی لەبەر چاو شیرین کراوە، بەحەرامی بێ و بەحەڵاڵی بێ هەوڵی بەدەست

---

[55] سورة ال عمران ٦٠

هێنانیــان دەدات، بــەڵام خــوای گــەورە دەیــەوێت إنــسان بــە ڕێگایەکی شـەرعی هـەوڵیان بۆ بدات. بەڵام إنسانێك کـە بیر لـە خـودا نەکاتـەوە بەحـەڵاڵ و بەحـەرام هـەوڵی بەدەسـت هێنانیـان دەدات. ئیتر چۆن بـە دەستی دێنێ گرنگ نیـە بەلایـەوە. کەواتـە خوێنەرانی خۆشەویست ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەهیچ شێوەیەك غـەریزەی جنـسی ڕەت نەکردۆتـەوە ، بـەڵکو هـاتووە ئـەم غـەریزە پـیرۆزە ڕێـك بخـات. لـە زینـاو لـەداوێن پیـسی دووری بخاتـەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ بەشێوازە تەندروستەکەی مـارەسـەی حـەزو ئارەزوە سێکسی یەکانی نـەکات سـەرەنجام خـۆی و میللـەتی لـە نــاو دەبــات ، قورئــانی پیرۆزیــش ئــەو ڕاســتی یــەی بــۆ تۆمارکردووین کە چەندین گەل و میللەت لـە ناوچوون و فـەوتان بەهۆی زیناو کاری بەدڕەوشتی یەوە

بەڵێ خۆشەویستان غەریزەی جنسی ئەوەندە پیرۆزە پێغەمبـەری سـەرودرمان (صـلی الله علیـه وسـلم ) بەخۆشـترین لـەزەتی دونیـا نـاوی بـردووە دەفـەرموێ ﴿ الـدنیا متـاع وخـیر متاعهـا المـرأة الصالحة ﴾[٥٦] خۆشترین و شیرینتر خۆشیەکانی دونیا ئافرەتـە ، بەنیـسبەت ئافرەتیـشەوە پیـاوێکی دڵـسۆز و بەوەفایـە ، بۆیـە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ڕوو لەگەنج و لاوەکانمان دەکات و دەفەرموێ ﴿ یا معشر الشباب من استطاع منکم البائة

---

[٥٦] رواه البخاری

فلیتـزوج ﷺ[٥٧٦٢] ڕوو لەگـەنج و لاوەکانمـان دەکـات کـە توێـژێکی گـەورەی کاریگـەرن لـە نـاو کۆمـەڵگاداو دەفـەرموێ هەرکەسـێ توانای هەیە واتە توانای مادی و جەستەی هەیە باژن بێنێ، بۆ ئەوەی کچەکان بە قەیرەیی نەمێننەوە و دواتر کێشە کۆمەڵایەتی و دیاردە دزێوەکان سەر هەڵ نەدەن. مەفهومی مخالەفەی ئەم حەدیثـە ی پێغەمبـەر(صـلی الله علیـە وسـلم) ئەوەیـە ئەگـەر گەنجەکانمان ژنیـان نـەهێنا سـەرەنجام کچەکانیـشمان شـوناکەن بەمـەش خێـزان بـەرەو داڕوخـان و لێـك هەڵوەشـان دەچـێ، بۆیـە خۆشەویـستی خـوا نـوری چـاومان حـەزرەتی محمـد المـصطفی (صـلی الله علیـە وسـلم ) داوا لـە گەنجـەکان دەکـات ژن بێـنن و پێویستی کردووە هـەموو لایەنـە پەیوەنـدی دارەکـانیش ڕێگـای ئەو سوننەتە پیرۆزەیان بۆ ئاسان بکەن، کەواتە بە هیچ شێوەیەك ئاینی ئیسلام غەریزەی جنسی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو هـاتووە ڕێکـی بخـات و خـەڵکی تـێ بگەیـەنێ کـە غـەریزەی جنـسی غەریزەیـەکی زۆر موبارەکـەو خـوای گـەورە لـە نـاخی هـەموو کەسێکدا بە ژن و پیاوەوە خەلقی کردووە ، ئینسان بە دەست کەوتنیشی لە ڕێگایەکی شەرعیانەوە ئەجروپاداشتیشی دەست دەکـەوێت ، صـحابەکان(ڕەزای خوایان لەسـەربێ) عـەرزیان کـرد ئەی خۆشەویـستی خـوا چۆن ئـەجرو پاداشـتمان لـێ ی دەسـت

---

[٥٧] رواه المسلم(١٤٦٧)

دەکەویت ، فەرمووی ئایە کەسێك لە ئێوە ئاوی خۆی نگفەی خۆی بخاتە ڕەحمی ئافرەتێکەوە بەحەرامی، بەزیناو داوێن پیسی بۆی حساب نیە ووتیان بەڵێ فەرموی دەی هەرکەسێکیش ئاوی خۆی بخاتە ڕەحمی ئافرەتێکەوە به حەڵاڵی کە هاوسەری خۆی بێ وەك نوێژو ڕۆژو فریشتەکانی خوا چاکەی بۆ دەنوسن،سەرەڕای ئەوەش پێکهێنانی خێزان سوکنایەکی دەروونی یە،ئێستا دکتۆرە بەڕێزەکان دەڵێن :ئینسانی بێ سێکس نەخۆشە، بۆیە شێخ جنیدی بەغدادی دەفەرموێ: (أحتاج الی الجماع کما أحتاج إلی القوت ) وەلآهی چۆن پێویستیم بە خواردن و خواردنەوەی باشە ئاواش پێویستم بە ژنهێنان و کاری ژن و مێردایەتی هەیە. سەیری کەن خوێنەرانی بەڕێز ئەم دینەی ئێمە چەند لەگەڵ فطرە تی سەلیمی ئینساندا دەگونجێ ئەگەر بەراوردێکی دینی ئیسلام بکەین بە دینی مەسیحی دەبینین لە نەصرانیەتی کۆنا پیاو ژنی نەدەهێنا و کچ شوی نەدەکرد، وە ئێستاش هەرکەسێك بچێتە وولاتی ڤاتیکانەوە ئەم ڕاستی یە دەبینێت کە هەموو ژن و پیاوێك کە دەچێتە ناو سنوری ڤاتیکانەوە ئیمزایەك دەکات کەنە ژن بێنێ و نە شوبکات وە هەرکەسێ ئەو کارە بکات ئەوا سزا دەدرێت، بە پێچەوانەی نەصرانیەکانیشەوە، ئەوروپی و ئەمەریکی یەکان ووتیان ئەوەمان هەر قبوڵ نیە، ئێستا لەئەوروپاو ئەمریکا کاتێ کە کوڕ ژن دێنێ و کچ شوو دەکات، کوڕوکچێك لەسەر جادە لە

دائیرەیەکا لە شوێنێکا کە بەیەکەوە ئیش دەکەن، کوڕەکە کچەکە دەخوازێ و دەڵێ :وەرە با بەیەکەو بژین تۆ شتێك بێنەو منیش شتێك تا دەبین بە ماڵێك هەرکاتێکیش لێك بێزاربوون و حەزیان لەیەك نەما بەیەك دەڵێن شتەکەی خۆت بۆخۆت و شتەکەی خۆم بۆخۆم و هەریەکەیان بەلایەکدا دەڕۆن و سەرگەرمی کاری خۆیان دەبن، بەلاّم لە ئیسلامدا ژن و مێردایەتی تەنها تێرکردنی غەریزەی جنسی نیە بەڵکو بەردەوامی یە واتە: بەردەوامی دانەبە ژیان و خستنەوەی نەوەیەکی نوێ یە

خۆشەویستان لەبەر گەورەی غەریزەی جنسیە ئەگەر کەسێك بپرسێت! ئایا گەورەترین خۆشی دونیا کامەیە؟ لە وەلاّمدا دەڵێن: ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت ﴿ الدنیا متاع وخیر متاعها المراة الصالحة ﴾ خۆشترین و شیرینترین خۆشیەکانی ژیانی دونیا بریتی یە لە ئافرەتی چاك و بۆ خوا صولحاو. بەڕاستی وەکو شاگردی قوتابخانەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەڵێین: (صدق رسول الله (صلی الله علیه وسلم ) نطق بالحق ) بەڕاستی وایە هەموو خۆشیەکانی دونیا بەستراوە بە ژنی ڕێك و پێك و باشەوە ، چونکە پیاو هەرچەندە گەورەبێت، هەرچەندە دەوڵەمەند بێت، هەرچەندە خاوەن قەوم و عەشیرەتی زۆر بێت ،هەرچەندە خاوەن شهادەی بەرزبێت، ئەگەر ژنی نەبێ، بەڕاستی ناتەواوەو هەموو ژیانی ژانەو هیچ لەزەت و خۆشی یەك ورناگرێ

لەم ژینە. جا ئەمەی کە باسمان کرد، بۆ ئافرەتیش هەروایە واتە گەورەترین خۆشی ژیان بۆ ئافرەتیش پیاوێکی دیندار و ڕەوشت بەرزو بەوەفایە .

دکتۆر علی شەریعەتی دەڵێت: هەموو مرۆڤێك وون بویەکی نیوەیە واتە: نیوەی لێ بزربووە بۆ ئەوەی مرۆڤێکی کامڵ و تەندروستی لێ دەرچێ، دەبێ بگەڕێ نیوەکەی تری خۆی بدۆزێتەوە، تۆ تەماشاکە کاتێ خوای گەورە حەزرەتی ئادەمی دروست کرد (سەلامی خوای لەسەربێت ) لەبەهەشتی پان و بەریندا داینا، ئەو بەهەشتەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەقەدەر بەقەدەر گۆچانێکی دەست کەوێت لەهەموو دونیا بۆی باشترە، کەچی حەزرەتی ئادەم لەو بەهەشتە خۆشەدا بەتەنیا ئۆقرەی نەگرت و هەتا ئەوکاتەی کە خوای پەروەردگار لەڕەگەزی خۆی ئافرەتێکی بۆ دروست کرد .واتە: حەزرەتی حەوای بۆ دروست کرد ، کاتێکیش کە سەرپێچی فەرمانەکانی خوایانکرد خوای گەورە هەردووکیانی هێنایە سەرزەوی و هەریەکەیانی بەجیا لە وڵاتێکی دوور لەیەکا دانا ، حەزرەتی ئادەمی لە هندستان داناو حەزرەتی حەوای لە جدەی سعودیە دانا، جارێکی تر حەزرەتی ئادەم هەستی کرد نیوەی لێ ونبووە خۆشەویستەکەی لێ بزربووە ، بۆیە شەو ڕۆژی خستە سەر یەك و چەندین وڵات و ڕووبەری جوگرافی بڕی هەتا گەیشتە سعودیەو لەشاخی عەرەفە

حەزرەتی ئادەمی دۆزیەوە و بەدیداری یەك شاد بوونەوە، سەر لەنویٚ ژیانێکی تازەیان دەست پێکردەوە، هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە هەردوکیانی بردەوە لقای خۆی. کەواتە: ئێستا بۆمان ڕوون بۆوە کە ئیسلام بە هیچ شێوەیەك نافەرمویٚ جنس شتێکی خراپ و پیسە، بەڵکو بەپێچەوانەوە خەڵات و بە خششێکی خوای گەورەیە بۆ مەبەستێکی بەرزو پیرۆزیش بە مرۆڤی بەخشیوە ، کە مەبەست لێی:

**یەکەم:** خستنەوەی وەچە.

**دووەم:** بەردەوامی دان بە ژیان، بۆیە هەموو علمایانی ئیسلام( ڕەحمەتی خوایان لێبێت ) دەفەرموون: جنس غەریزەیەکی خوا کردەو خوای پەروەردگار لە ناو ناخی هەموو کەسێکدا دروستی کردووە و قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵ گەورەبونی دا گەشە دەکات .

جارێك کتێبێکم خوێندەوە کە ئێستا ناوی کتێبەکەو نوسەرەکەیم لە بیر نەماوە ، ئەڵێ پیاوێك ژنێکی هەبوو زۆری خۆش دەویست و بەبێ ئەو ئیدارەی نەدەکرد ، بەڵام ویستی خوای گەورە وابوو ئەم ژنە وەفاتی کردوو مرد بەڵام لە دوای خۆی کوڕێکی چاو گەشی بۆ هاوسەرەکەی بە جێ هێشت، پیاوەکەش بەلەدەست دانی خێزانەکەی زۆر مەحزون وخەفەتبار بوو، ورتی : تازە من لەدوای خێزانەکەم ژیانم بۆ چی یە؟ ئەڕۆم لەو شاخە لە ئەشکەوتێکدا لە گەڵ کوڕەتاقانەکەمدا بەیەکەوە دەژین. ئەوەی پێویست بێت لەگەڵ خۆیانا بردی و ڕۆیشتن،

هەموو ساڵێکیش سێ چوار جار دەهاتەوە ناو شار و کەل و پەل و پێداویستی ژیان و خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگی دەکری و دەگەڕایەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە ، بەڵێ ساڵ هات و ڕۆی پیاوەکە خۆی چووە تەمەنەوەو کوڕەکەشی پێگەیشت، تا ڕۆژێکیان بە کوڕەکەی ووت وەرە ڕۆڵە شرینەکەم، من هیچی کە تاقەت وتوانام نەماوە بچم شت بێنم لە ناو شار تۆ وەرە لەگەڵم با شارەزابی و لەمەودوا تۆ بچی لە شارەکە شت بێنی، بەڵێ ڕۆیشتن و گەیشتنە ناو شارەکەو کوڕەکەی چونکە ئەوە یەکەمجار بوو شتی دەبینی یەکسەر دەستی دەکرد بە پرسیارکردن ،ئەیوت: باوکە گیان ئەوە چی یە ؟باوکی ئەیوت: ڕۆڵەگیات ئەوە مرۆڤە .تۆزێکی تری پێ دەچوو شتێ کی تریان دەبینی زۆربەلایەوەسەیربوو دوبارەپرسیاری دەکردەوە باوکەگیان ئەوە چی یە ؟ ڕۆڵە ئەوە خانووە باوکە ئەی ئەوە چی یە ؟ ڕۆڵە ئەوە سەیارەیە باوکە ئەی ئەوە چی یە ؟ ڕۆڵەگیان ئەوە تەیارەیە . ئەڵێ لە ئاخریا کۆمەڵێ کچی بینی ووتی : ئەی توخوا باوکەگیان ئەمانە چین ؟ بەخوا ئەمانە زۆر جوانن ! ووتی:ڕۆڵە ئەوانە سۆنەی سەوزن، ووتی: توخوا باوکەگیان دانەیەکم لەوانە بۆ بکڕە و با لەگەڵ خۆمانا بیبەینەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە. سبحان الله ئەم کوڕە هەرچەندە لەدوری ئاوەدانی گەورە کرابوو وە یەکەمجاریشی بوو ئەو شتانەببینێ کەچی زیاد لەو هەموو شتە داوای ئافرەتەکەی کرد. کەواتە

غەریزەی جنسی یەکێکە لەو غەریزە موبارەکانەی کە خوای گەورە لەناو ناخی هەموو مرۆڤێکدا دروستی کردووە جا فەرقی نیە ژن بێ یان پیاو وە پێویستیشی کردووە کە هەر یەکەیان لە رێگای شەرعیەوە هەقی خۆی بداتێ. کەواتە ژنهێنان و شوکردن جوابدانەوەی ئەو بانگەوازەیە کە خوای گەورە لە دەروونی هەموو مرۆڤێکدا خەلقی کردووە، چونکە ئینسان فگرەتێکی هەیە تۆ تەماشا کە برسیت بوو، دەرونت پێت دەڵێت برسیتە، تینوت بوو پێت دەڵێ: تینوتە، کە سەرمات بوو، ماددەیەك لەلەشتدا هاوار دەکات و پێت دەڵێ گەرمی بەکاربهێنە، کە گەرمات بوو کونیلەکانی لەشت دەکرێنەوەو مێشك پێت دەڵێ: راکە سێبەرێ فریای ئاوێکی سارد، بەرپانکەیەك مبەریدەیەك سپلێتێك بکەوە، بەهەمان ئەو جۆرەش لە ناو ناخی إنسان دا غەریزەیەك هەیە پێی دەوترێت غەریزەی جنسی یان غەریزەی سێکسی یان غەریزەی ئارەزووی جوت بوون ، ئەمەش خوای پەروەردگار لە ناوناخی مرۆڤا خەلقی کردوە و غەریزەیەکی زۆر موبارەکە ، ئەگەر ئەم غەریزەیە نەوایە ژیان نەدەبوو بۆیە علماو دەفەرموون: ئەگەر ئارەزوی جنسی نەبوایە ، هیچ پیاوێك ئامادە نەبوو ژن بێنێ و ئەو بارەگرانەی ژن و منداڵ و زەحمەتی خێزان و بۆڵە بۆڵی ناو خێزان لە ئەستۆی خۆی بگرێ ، وە هیچ ئافرەتێکیش ئەگەر ئەو غەریزە خوای نەبوایە ئامادەنەبوو ، ئازاری منداڵ بوون بکێشێ ئازاری ماڵ و میوان و زەحمەتی

ماڵ بکێشێ ، بەڵام بەهۆی ئەو غەریزە توندەوە ، خوای گەورە حیکمەتی وایە کە درێژە بە ژیانی مرۆڤایەتی بداو زوریەت زۆربێ بەڵێ بەهۆی غەریزە جنسیەوە نەبوایە قەت دایك ئامادە نەبوو ژانی مندالْ بوون و شەو و شەونخونی و نۆ مانگ هەڵ گرتنی مندالْ بە پێستی سك هەڵ بگرێ، خوای گەورە لەگەڵ ئەم هەموو ناڕەحەتیەدا، چێژوو لەزەتیشی تیا دروست کردووە، کەواتە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە جنس خەڵاتی خوایە، بەڵام ئینسانی بێ دین و خوانەناس ناشرینی دەکەن، هەروەها بەهۆی جنسیەوەیە کە ژن و ژنخوازی لەنێوان مرۆڤەکان دا دروست دەبێت ، سەرەنجام بەهۆی ئەو ژن و ژن خوازی یەوە، هۆزو گەل و میللەت دروست دەبێت، جاری وا هەیە هیچ تیرەو هۆزێك یەکیان نەناسیوە بەڵام بەهۆی ژن و ژنخوازی یەوە بونەتە خزمی یەك و خوێنیان تێکەڵ بەیەك بووەو وەکو کوردی خۆمان فەرموویەتی: (( ڕیخۆڵەیان تێکەڵ بووە ))

بەڕێزان غەریزەی جنسی ئەوەندە غەریزەیەکی موبارەکە قەت ئیسلام ڕێگەی لە ئینسان نەگرتووە ، کەوا شارەزایی و ڕۆشنبیری جنسی نەبێت، بەڵام بەمەرجێك لە چوارچێوەی ئیسلام و مە نطقا تێ نەپەڕێ، بەڵکو بەرنامەیەکی ڕێك و پێك و تەاویشی بۆ داناوە

خوێنەرای بەڕێز ئاینی پیرۆزی ئیسلام کاری جنسی و کاری سێکسی بەعیبادەت و خواناسی داناوە ئەگەر ئەو ژن و پیاوە

لەســــەر فـــەرمودەی خـــواو پێغەمبـــەری خـــوا بەیـــەك گەیـشتبن،بەواتایەکی تـر سـەرەڕای چێژ وەرگرتنـی ڕوحـی و دەرونی، مرۆڤی مسوڵمان ئەجرو پاداشتیشی دەست دەکەوێت.
واتە: بە پێچەوانەی هەموو بیروباوەڕەکانی دونیا کە جنس وەك هۆکارێکی چێژ وەرگرتن سەیر دەکەن. ئەبوزەڕی غەفاری ڕەزای خوای لەسەر خۆی و هەموو صەحابە بەڕێزەکانی خۆشەویست بێ. بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ، پێغەمبەری خوا فەرموی ﴿ عن أبي ذر الغفاري ( رضی الله عنه ) قال رسول الله.(( في بضيع أحَدِكم صدقة )) يارسول الله (صلى الله عليه وسلم ) أيأتي أحدنا شهوته ، ويكونُ له بها أجر ؟ قال (صلى الله عليه وسلم ) أرأيتم لو وَضَعَها في حَرامٍ أكان عليه وزر ؟ فكذلك إذا وضَعَها في الحلال كان له أجرا ﴾[58] واتە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بە صحابەکانی فەرموو : هەر یەکێ لە ئێوە کە دەچێتە لای خێزانەکەی خۆی و کاری سێکسی لەگەڵا دەکات ، خێروپاداشتی لای خوای گەورە بۆ دەنوسرێت، بەسەر سوڕمانەوە صحابەکان فەرموویان: ئەی خۆشەویستی خوا ئێمە بۆ خۆمان چێژو خۆشەویستی وەردەگرین لای خواش ئەجرو پاداشتمان بۆ دەنوسرێت ؟! فەرموی: بەڵێ. وتیان چۆن فەرموی باشە ئەگەر ئێوە ئاوی خۆتان، مەنی خۆتان بکەنە ناو

---

[58] رواه المسلم

ڕەحـــەمی ئافرەتێکـــەوە بەحـــەرامی بـــەزیناو گونـــاح بۆتـــان نانوسـرێ. ووتیـان: بـەڵێ. فـەرموی : ئـاواش ئەگـەر بیکەنـە شـوێنێکی حەلاڵـەوە ئەجروپاداشـتی بـۆ دەنوسـرێ. ئەمـەش پیرۆزی و موبارەکی جنس دەردەخات لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ، بەڵکو لەوەش زیاتر ئیسلامی پیرۆز گرنگی بەکاری جنسی داوە، تەنانەت لەکاری سێکسی نێوان ژن و پیاودا، ڕێگە نادات هیچ یەکێ لە ژن و پیاو کە زوڵم و ستەم لەیەك بکەن و مافی ئەوی تریان پێ شێل بکەن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفـەرموێ : ﴿ إذا جـامع أحـدكم أهلـه، فليـصدقها ثُـمَّ قـضى حاجته قبل أن تقضى حاجتها فلا يعجلها حتى تقضى حاجتها ﴾ واتە: هەریـەکێك لـە ئێوە لەگەڵ ژنەکەی خۆی دا ، کۆبـۆوەو کاری سەرجێ ی کرد، کاتی کە پیاوەکە زوتـر تـەواو بـوو ، بـەڵام ژنەکەی هێشتا تەواو نەبوو بوو یعنی چێژی خۆی وەرنەگرتبوو ، با پەنەنـەکا و هەڵنەستێتەوە هـەتا ژنەکەشـی تـەواو دەبێـت و چێژی خۆی وەردەگرێت ، سەیری کە هـەزارو سـێ سـەدو سـی و سـێ سـاڵ زیـاتر لەمـەوپێش لـە سـەر زمـانی پێغەمبەرەکـەمان حەزرەتی محمد (صلى الله عليه وسلم ) باس کراوە، کەچی تازە بەتازە خـەڵکێك دێ بـەناوی پێشکەوتن و مۆدێرنـەوە دەیـەوێت بڵـێ دیـن کۆنەپەرسـتی و دواکـەوتوی یـە. ڕۆشـنبیری سێکسـی فێری گەنج و لاوەکانمان بکەین بەڵام بێ ئاگا لـەوەی کـە ئیسـلام لەسەر دەمێکدا پێغەمبەرەکەمان .باسـی کردووە، کە لـە نیمچە

دورگـەی عـەرەبی دا ئـافرەت نـەك مـافی سـەرجێیان لـیٚ زەوت کرابـوو ، بـەڵکو زیندەبەچـاڵیش دەکـران، بەداخـەوە لـەم سـەردەمەی خۆشمـان دا، کـاتیٚ کـە ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان دەخوێنینەوە بەتایبەت ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە پەیوەندیان بەمەسەلە سێکسی یەکانەوە هەیە دەڵێن: بەپێی ڕاپرسیەکان لـەم سـەردەمەی خۆشمانـدا، زۆربـەی ئافرەتـان چـێژ لـەکاری سەرجیٚ ی وەرناگرن، بەهۆی مامەڵەی خراپی پیاوەکانیانەوە لە کاتێکـدا ئیـسلام بەهـەموو شـێوەیەك ڕێگـری لـە توندوتیـژی سێکسیش گرتووە، توخوا ئەگەر محمد (صلی الله علیه وسلم ) پێغەمبەری خـوا نـەبیٚ چۆن لەکۆمەڵگەیـەکی ژن کـوژی بیابـان نـشینی وەك ئەوکاتـەی شـاری مەککـەو مەدینـە باسـی ئـەوەی دەکرد ؟!. لەوەش زیاتر لە فەرمودەیـەکی تـرا، پێغەمبـەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمویٚ :﴿ لاترموا علی نسائِكم بل إعجلوا بینکم و بینهن روسلاً.....قبل وما الرسول یا رسول الله...؟ قال: القُبلة ﴾[59] فەرموی: لەڕەوشتی ئیماندار نیە ، کە وەك و ئاژەڵ کاری سەرجیٚ ی لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بکات بەڵکو پێویستە قسەی خۆشی و یاری کردنیان لە بەینا هەبیٚ کە هـەم خۆشەویـستی دروسـت دەکـات هـەم ئامادەباشـیش بۆوکارەدروست دەکات کە ئێستا زانایانی بواری جنسی ئەم

---

[59] رواه امام مسلم/کتاب حیض باب استحباب استعمال مغتسلة وضع فرصة من مسك في موضع الدم ج1 ص261

ڕاستیەیان بۆ دەرکەوتووە و دەفەرمون قسەی خۆش و یاری کردن کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ئامادەباشی هەردولایان بە تایبەتی ئافرەت !. وە زانایانی ئیسلامیش لەناو کتێبە پیرۆزەکانی خۆیاندا باسی ڕۆشنبیری سێکسیان کردووە. بۆ نموونە إمامی ڕازی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێ: کاری سەرجێی لەگەڵ خێزانەکەی خۆت دا مەکە هەتاوەکو گەمەی لەگەڵدا نەکەی و یاری بە شوێنە جنسی و ورووژێنەرەکانی نەکەی، بەواتایەکی ڕونتر هەتا ماچی نەکەی و مەمکی نە گوشی و قسەی خۆشی بۆ نەکەی ، چونکە کە ئەمانەت نەکرد لەوانەیە ساردی سێکسی ڕو لە ئافرەتەکە بکات، بەڵام کە ئەمانەت کرد ئەویش ئامادە دەبێ و ئەوکاتەش ئارەزوی لە نێوچاوانی دەردەکەوێت لێرەشەوە گەورەی و عەزەمەتی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێت کە چەند گرنگی بە غەریزەی جنسی داوە، دەشیەوێت هەموو مرۆڤێکی مسوڵمان ڕۆشنبیری یەکی دروست و زانستی هەبێت لەسەر جنس و کاری ژن و مێردایەتی و ناسینی ئەندامەکانی لەشی خۆی ، بەڕاستی جێگەی خۆشەویستی گەنج و لاوەکانمانە زانیاری دروست و زانستیان هەبێ لەسەر مەسەلەی باڵغ بوون دەرکەوتنی موو خەو بینین و دەرچونی خوێنی بێ نوێژی و پەیدابوونی موو ، مەمك و گڕبوونی دەنگ و هیچ شەرم کردنێکی تێدا نیە حەزرەت عائیشەی دایکی ئیمانداران ( ڕەزای خوای لەسەر بێت ) بۆمان

دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ ﴿ نعم النّساءُ نساء الأنصار لم يكن بمنعِهنَّ حياءٌ أن يَتَفَقهن في الدين ﴾ واتە چاکترین و باشترین ئافرەت ، ئافرەتانی ئەنصارین کە شەرمیان نەدەکرد لە پرسیارکردن بۆ شارەزابوون لە دینەکەیان بۆ نمونە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) پرسیاری چۆنیەتی خۆپاك کردنەوەی کاتی بێ نوێژی لێ کرد، دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ فێربوونی ئافرەتی مسوڵمان لەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە ئافرەتانەوە هەیە حەزرەتی عائیشە ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرموێ لە خزمەت پێغەمبەرا دانیشتبووم ئافرەتێك هات پرسیاری دەربارەی خۆپاك کردنەوە لە بێ نوێژی کرد، کە چۆن خۆی پاك بکاتەوە ؟. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموی ﴿ خزی فرصة من مسك فتطهري بها ، قال : كيف أتطهر ؟ قال تطهري بها قالت : كيف ؟ قال : سبحان الله تطهري !! فاجتذبتها إلىَّ ، فقلتُ تتبعي أثر الدم ﴾[60][67] فەرموی پارچەیەك پەڕۆی پاك بهێنە و خۆتی پێ پاك بکەوە. ئافرەتەکە ووتی: چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بکەمەوە، فەرموی خۆتی پێ بسڕەوە ووتی: ئاخر چۆن ؟ فەرموی: سبحان الله خۆتی پێ پاك بکەوە. حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: دەستی ئافرەتەکەم گرت و بۆلای

---

[60] صحیح البخاری کتاب حیض

خۆم ڕام کێشاو پێم ووت: بەشوێنی خوێنەکەتیا بهێنە و جوان جوان بیسڕەوەو پاك و پوختی بکەوە لە کاتی خۆشتنەوەت دا لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێ ﴿أن رسول الله (صلی الله علیه وسلم ) إستحیا فأعرض بوجهِهِ﴾[61] واتە : ئەو ئافرەتە پرسیاری خۆ پاك کردنەوەی لە پێغەمبەر کرد (صلی الله علیه وسلم ) شەرمی کردوو ڕووی خۆی وەرگێڕاو . بەکورتی دەگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمان کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێ: ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتی ئەنصاریەکان بێت کە پرسیاریان دەکرد، دەربارەی مەسەلەکانی ئافرەتان تا شارەزای و ڕۆشنبیری یەکی باشیان هەبێ، وە ئێمە وەك و مسوڵمان پێویستە ئەوە بزانین یەکێ لەتایبەتمەندی دینەکەمان ئەوەیە شتێك نیە باسی نەکردبێ

خۆشەویستان لێرەدا پرسیارێك دروست ئەبێت ئەوەیش ئەوەیە دەڵێن: پیاو و ژن حەزی جنسی و سێکسیان هەیە بەلاَم باشە بۆچی پیاو واجب نیە لەسەری کە قۆڵی داپۆشێ و دەستی داپۆشێ و قاچی داپۆشێ، قەیچێکە با ئافرەتیش هاوشانی پیاوبێ ، هەرچەندە ئێستا لە هاوشانی پیاو تێ پەڕیوە ، ئێستا پیاوێك تۆزێك پانتۆڵەکەی کورت بێ بە خوا لە ڕووی نایەت لە

---

[61] هەمان سەرچاوەی پێشوو

پێ ی بکات ، توخوا پانتۆڵەکەت یان شرەواڵەکەت بێتە سەر قولە پێت کە سونەتی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم ) لەبەری دەکەی دەڵێ ی نەبەخوا عەیبە ؟! کەچی بەداخەوە ئێستا ئافرەتانمان هەیە پانتۆڵی لە پێدایە بەلام پانتۆڵەکەی نیوەی قاچی براوەتەوە وەلامی تەکلیفێکی زۆر لە پیاوێك بکەی بڵێ بەم پانتۆڵەوە بچۆرە بازار ناچی ئەڵێ عەیبە ، کەچی ئافرەتەکە بە پێشکەوتنی دەزانی ، یەعنی ئافرەتان لە پیاوانیش تێ پەری کردووە نەك هەر هاوشانی پیاوبێت و وەکو ئەو رووت بێ بەڵکو زۆر لەو رووت ترە ئێستا پیاوێك بنباڵی بەدەرەوەیە یان فانیلەی عەلاگەی لەبەرا بێ لە ناو بازارا لەناو کۆرو کۆمەڵ و کۆبوونەوەکاندا حەیای دەچێ ، هەر من و تۆ لۆمەی دەکەین ، کەچی ئەمڕۆ ئافرەت لەناو دائیرەو کۆرو کۆمەڵ و بازاڕەکاندا نیوەی لەشی دیارە ئەگەر دەڵێ ی بۆچی وایە بۆچی حیجاب ناکەی دەڵێ ئەرێ ئەمە هەر نەبڕایەوە ئەی بۆچی پیاو حیجابی لەسەر واجب نیە ئایا فەرقی ژن و پیاو هەیە لەوەلامدا دەڵێین: بەڵێ ئەگەر باوەڕت بەخوا هەیە ئەمری خوا مناقەشەی تێدا نیە و ئێمە وەکو مسوڵمان و ئیماندار دەڵێین: ( سمعنا وأطعنا) خوا بۆخۆی زاناو کار بەجێ یە فەرمانەکانی لەشوێنی خۆیدان و هەمووی پڕن لەزانست و حیکمەتی گەورە گەورە بەلام من لێرە دا دەمەوێت بەشێوەیەکی زانستی و لەسەر قسەی یەکێ لە مفکرە عەلمانیەکانی ئەم سەردەمەوە وەلامیان بدەمەوە و ڕەدی

خۆیـان بدەمـەوە ئـەویش ( دکتـۆرە نـەوال سـعداوی ) یـە کـە لەکتێبێکی دا بەناوی ( الرجل والجنس ) لە لاپەڕە سەدو حەفتاو چواری ئـەو کتێبـەدا کـە بـەزمانی عـەرەبی نوسـیویەتی و ئـەم ئافرەتە دکتۆرەیـە کـە یەکێکـە لـە چـەپ گـەڕا توندەکانی دژ بـە ئیـسلام و زۆر دژایـەتی ئیـسلام دەکـات و یەکێکیـشە لـە بانگەشـەکەرانی بـیری فیمنیزمـی ئافرەتـان کـەبیری فینیزمـە فکرەیەکە لە ڕۆژئاوا و ئەوروپاوە هاتۆتە ناو جیهانی ئیسلامی ، وە ئەم ئافرەتـە دژ بە خـواو پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیـە وسلم ) قسە دەکات بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا بە ویژدانـەوە قسە دەکات و دان بەو راستیەزانستی یـەدا دەنێت و دەڵێت: هەرچی زانایـانی بواری دەروون ناسـی و پسپۆڕانی بواری لێکۆڵینەوەن لـە لایـەنی سێکسی و جنسی پیـاو ئـافرەت، سـەریان سوڕماوە لەو جیاوازی یە گـەورەی کە لـەنێوان پیـاو ئـافرەت دا هەیـە لـە بـواری وروژانـدنی هۆڕمۆنـە جنـسی یـەکانی کەلـەناو لەشـیاندا هەیـە، ووتیـان: چـۆن؟ ووتـی : ئێمـە لـەڕوی زانـستی یەوەئەوراسـتیەمان بۆدەرکـەوتووە پیـاو بـەس بـە سـەیرکردنی ئـافرەت دەوروژێـت بـەس بەدەرکـەوتنی تـۆزێ لەقاچـی بـەس بەدەرکەوتنی بستێ لە ڕانـی ، بەس بەوەی وێنەیـەکی ببینێ ، بـەس بـەوەی خـەیاڵی لێبکاتـەوە بەس بەوەی کـە تـۆزێ بـۆنی ئافرەتێك بێ بەسەریا سبحان الله لـە گـەورەیی ئـەم دینـەی ئێمـە بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرموی ﴿ والمرأة

إذا إستعطرت ، فَمَدَت بالمجلس كذا وكذا ، يعني الزانية ..﴾[٦٢]
فەرموی هەر ژنێك خۆی بڕازێنێتەوە و بۆنی خۆش لە خۆی بدا بۆ ئەودی کە چووە دەرەوە کە چووە ناو بازاڕ و دائیرەو شوێنە گشتی یەکان مەبەستی ئەوە بوو سەرنجی پیاوان بۆلای خۆی ڕاکێشێ ، ئەوە وەکو زیناکار وایە کە خۆی معگر دەکات و خەڵك بۆنی دەکەن ، دکتۆرە نەوال دریژە بە قسەکانی دەداو دەڵێ: بە بۆنی ئافرەت بە جموجۆڵی بەوەی پیاوێك گوێ ی لە خشپەی پێڵاوەکانی ئافرەتێك بێ بەسەیرکردنی جل و بەرگەکەی، یەکسەر پیاو ئارەزوی سێکسی و جنسی بۆ ئافرەت دەجوڵێ بەلام زانست ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کە ئافرەت وانیە ، ژن بەمانەی باسمان کرد هیچ تەئسیراتێکی نیە لەسەری یعنی ئافرەت پیاو بەڕوتیش ببینێ زۆر تەئسیراتی تێ ناکات ووتیان چۆن ؟ ووتی: ئافرەت بەدەست لێدان، بەتایبەت لەپی دەستی کە شەرع دەفەرموێ لەپی دەست شوێنی شکانی دەست نوێژە، ئەڵێ ئەم لەپی دەستە وەکو سەحنێکی سەتەلایت وایەو هەموو هێزەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ بۆیە ئیسلام قەدەغەی کردووە کوڕو کچ ژن و پیاوی نامەحرەم تەوقە لەگەڵ یەکدا بکەن .
پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێ: ﴿ لأن يُطعَنَ في راسِ احَدِكُم بمخَيطِ مِن حَديدِ خَير لَهَ من ان يَمسَّنَ إمراة

[٦٢] رواه ابوداود ،والترمذى ،وقال حديث حسن صحيح

لاتحلُ لـه ﴾[٦٣] فـەرموی : ئەگـەر بـە ئاسـنی نـوك تیـژ و تـورس لەسەری یەكێك لە ئێوە بدرێت، هێشتا ئەوەی باشترە كە دەست بخاتـە دەستی كەسێكەوە كە بۆی حەڵاڵ نەبێت، دكتـۆر نـەوال ئەڵێت: ئافرەت بەس بەدەست لێدان و بە تەوقەكردن و بە باوەش پێداكردن. ئـارەزوی جنـسی دەوروژێـت ،هـەروەها بـە بـاوەش پێـداكردن و بەخوێندنـەوەی كتێـب و بابەتـە جنـسی یـەكان و هـەروەها بەنـەرم قسەكردنی پیاوان و عاتیفە جوڵانـدنی ئـافرەت بەم شتانە ئارەزوی سێكسی و جنسی دەجوڵێ و مـەیلی دەڕوات بـۆلای پیـاوان، بـەڵام بە پێچەوانەی ئافرەتـەوە پیـاو بەبـچوكترین جەسـتەی ئـافرەت جـنس و هۆڕمۆنـەكانی ئـارەزوی دەجـوڵێ! ئەمـە قسەی دكتۆرە نەوال سعداوی یە كە یەكێكە لە بانگەشـەكەرانی بیری فیمینـزم لـە هـەڵگرانی بیری چـەپ گـەڕای دژ بـە ئیـسلامە، كەواتـە دەڵـێین: خـوای گـەورە كـە دروسـت كـەرو بەدیهێنـەری ئـەم ەرۆڤـ و بونەوەرەیە، جوانی فەرموەكە دەبێت ئافرەت خۆی داپۆشـێ چونكە جەستەی جیاوازە لەگەڵ پیاودا. بەڵێ ئێمە وەك و موسڵمان دڵمان خۆشـە بەدینەكـەمان چـونكە هـەتا زانـست و زانیـاری پـێش بكـەوێ دڵنیـابن ڕاسـتی و جـوانی دینەكـەمان زیـاتر دەردەكـەوێت وە تـەنها ئیسلامیـشە چارەسـەری هـەموو دەردە سیاسـی و كۆمەڵایـەتی و ئابوری یەكانی جیهان دەكات بۆ نمونە ئەمڕۆ هەرچەندە زانـستی پزیـشكی پـێش كـەوتووە بـەڵام نـاتوانێ چارەسـەری ئـەم هـەموو

---

[٦٣] رواه الطبراني في الكبير وصححه الألباني في صحيح الجامع( ٥٠٤٥)

نەخۆشبە بکات ، وەکو نەخۆشی ئایدز بەرۆکی مرۆڤایەتی گرتوە بەتایبەتی کیشوەری ئەفریقا و ئەوروپاو ڕۆژئاوای گرتووە ، تەنها ڕوناکی یەك مابێ ئیسلامە! ئەوەتا جۆرج بۆش لە کۆبونەوەیەکی تایبەتی خۆی دا ، ڕەخنەی لێگیرا کە لە لایەن چەند ئەندامێکی کۆنگرێس و پەرلەمانی ئەمریکاوە ووتیان تۆ ساڵانە بڕیارت داوە و ئیمزات کردووە بە ملیارەها دۆلار لە جەنگی عێراق و ئەفغانستان سەرف دەکەی ووتیان ئەی باشە بۆچی ئەو پارەیە لە وڵاتەکەی خۆماندا سەرف ناکەی بۆ چارەسەری نەخۆشی ئایدز. کە ئایدز بەهۆی بێ ڕەوشتی و داوێن پیسی یەوە بڵاو دەبێتەوە و ساڵانە بەهەزارەها خەڵك لە ئەمەریکا دەکوژرێ ، خوا پەنامان بدا و لە میللەتمان بە دوور بێت کە ئەو نەخۆشی یە زۆر ترسناکە و تائێستا چارەسەری بۆ نەدۆزراوەتەوە ، بەجۆرێ نەخۆشەکە دەستی بەر هەرکەسێك بکەوێت یان ماچی هەرکەسێك بکات یان خوێنی لەگەڵ هەرکەسێك تێکەڵاو بێت هیچ دەرمانێك نیە چارەسەری بکات هەتا هەموو لاشەی دەڕزێ و دەمرێ. ڕەخنەیان لە جۆج بۆش گرت ووتیان: ئەی بۆچی بە ملیارەها دۆلار سەرف ناکەی بۆ چارەسەری ئایدز لەئەمەریکادا، ئەویش بە ڕاشکاوانە وەڵامی دانەوە و وتی: چارەسەری ئایدز بە پارە ناکرێ بە دۆلار ناکرێ، ئەگەر ئەتانەوێ چارەسەری ئایدز بکرێ ئەبێت ئەخلاق و ڕەوشت بۆ گەلی ئەمریکا بگەڕێتەوە، هەروەختێ ئافرەتی ئەمریکی وەك و ئافرەتی موسڵمانەکان حەیاو حورمەتی هەبوو و حیجابی لەبەرابوو ئەوکاتە دڵنیابن ئایدز لە ئەمریکادا نامێنێ، ئەوە قسەی پیاوێکە کە

ولاتەکەی سەرۆکی جیهانی ئەمڕۆیە دانیشی بەو ڕاستیە گەورەیەدا دەنێ و حیجاب بە گەورە دەزانێ، جا خۆشەویستان حیجاب تەنها پارچە قوماشێك نیە و ئافرەت بەسەری دا بدات وەك و ڕاهیبەکانی مەسیحی بەداخەوە جاری واهەیە ئافرەتی بالاپۆش و موحەجەبە دەبینم حیجابی لە بەرایە و لە حزبێکی لادینی و عەلمانی دا کاردەکات وا ئەزانم ئەو خوشکە بەڕێزەپێویستی بەبەخۆداچونەوە هەیە کە لەوانەیە لە حیجاب و واتای بالاپۆشی نەگەیشتبێ.

ڕەحمەتی خوا لە شاعیرێك بێت کە بە حەق دەڵێ :

حیجـــــــاب تاجــــــــــه
بە سەری هەمـــــوو کەس ناشێ
ئاڵای دەوڵـــــــەتی ڕەوشـــــــتە
نەك تەنها پارچـــــــــــە قوماشێ
چەکی بەرگـــــــــــــری و شەرەفە
ئەسمێ گشـــــت گـورگ و داڵاشێ

کەواتە: خۆشەویستان ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئیسلام ڕێزی لە غەریزەی جنسی گرتووە و بە غەریزەیەکی مبارەکیشی داناوە! کاتێ مێژوی زێڕینی حیجابەکان بخوێنینەوە ئەبینین کە حەزرەتی عمری کوڕی خگاب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) شەو و ڕۆژ بە ناو شار و میللەتەکەیدا دەگەڕا و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی موسڵمانانی دەدا. بۆ نمونە شەوێك بە ناو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕا لە دوای نیوەی شەوەوە گوێی لە

دەنگێکـــی غـــەریبی ناســك بـــوو ، کـــە ورد دەبێتـــەوە بـــۆی دەردەکەوێت ئەوە دەنگی ئافـرەتە، ئافرەتێکە بـە تـەنها لـە مـاڵی خۆیـدا دانیـشتووە دەنـاڵێنیٚ و بـە شـعر لەگـەڵ نـاخی خۆیـدا دەدوێت! ئیمامی عمر زیاتر گوێی بە لای دەرگاکەوە دەنیٚ بزانـیٚ شەکوای حاڵی چیە؟ تەبعەن ئافرەتەکە مێردەکـەی لـە مـاڵ نیە و ئـەویش تـازە بوکـە، قەسـیدەیەکی درێـژی بـە عـەرەبی هەیـە کـە دەڵێـت : خۆزگــە ئـەم شــەوە ئەوەنـدە درێــژ نەبوایــە ، خۆزگــە هاوسەرەکەشـم ئێـستا لێرەبوایـە، وەڵــاهی ئەوەنــدەی حــەز لــە پیاوەکەیـەتی بۆیـە بـە ئاشـکرا لـە شـعرەکەیا دەڵـیٚ وەڵـاهی لـە ترسی خـوا و خـاتری مێردەکـەم و حـەیا و حورمـەتی بنەماڵەکەم نەبوایە، ئێستا پیاوێکی بێگانەم دێنایەماڵەوە لەگەڵما ڕاکشایە، جـا ئـەم ئافرەتـە ئیمانـدارە ئـەم حـەزە جنسیەی خـۆی بـە شـعر دەردەبـڕیٚ ، واتــە ئــافرەتێکی شــاعیرە، یەکـسەر ئیمـامی عمـر زەڕبێـك لـە دەرگـای ماڵەکـەیان دەدات ، بـەیانی نوێنـەری خـۆی دەنێـریٚ تـا بزانـیٚ ئـەو ماڵـە هـی کێیـە و ئـەو ئافرەتـە کێیـە ؟ نوێنەردەکەی کە هاتـەوە وتـی : قوربـان ئـەوە ژنـی مجاهـدێکی "فی سبیل اللـە"یە مێردەکەی ڕۆیـشتووە بـۆ غـەزا و نەگەڕاوەتـەوە ، حــەزرەتی عمــر فــەرموی هاوســەرەکەی چــەند ڕۆژە ڕۆیــشتووە وتیان وەڵا شەش حەوت مانگە ، ئێستا وا لـە جەبهەکانی عێـراق و شەڕەکانی عێراقە و نەگەڕاوەتەوە، ئـا لـەو کاتـەدا ئیمـامی عمـر چـی دەکـات ؟ چـوو بـۆ لای حفـصە خـانی کـچی کـەخێزانی

پێغەمبەری خوایە "صلی الله علیه وسلم" ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لەسەر هەموو خێزانەکانی خۆشەویستی خوا بێت. فەرموی حفصە خان وەرە شتێکت لێ دەپرسم شەرم مەکە و پێم بڵێ، فەرموی : باوکە گیان چیە ؟ فەرموی: ڕۆڵەی شیرینم توخوا ڕاستم پێ بڵێ ژن تا چەند بەبێ مێردەکەی یان ڕونتر بڵێین تا چەند بە بێ کاری سەرجێیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئیدارە دەکات؟ حفصە خان سەری داخست و فەرموی باوکە گیان چۆن پرسیاری ئاوا لە من دەکەی، فەرموی کچی شیرینم ئەم پرسیارە ئیشی موسڵمانانی پێوە بەندە و منیش زۆرم ئیش پێیەتی وەڵامم بەرەوە ، فەرموی باوکەگیان چوار مانگ بۆ پێنج مانگ ، حەزرەتی عمر تێگەیشت ، یەکسەر مەرسومی جمهوری دەرکرد و فەرموی لە عمری کوڕی خگاب ئەمیری موسڵمانانەوە بۆ هەموو بەرەکانی شەڕ لەمەو دوا نابێ هیچ سەربازێك لە بەرەی شەڕدا لە سێ مانگ زیاتر بمێنێتەوە ، ئەویش مانگێك بۆ ڕۆیشتنی ڕێگای لەمسەرەوە مانگێکیش بۆ مانەوەی ، هەر ئەمیر و فەرمانڕەوایەکیش ئەم فەرمانە جێ بەجێ نەکات خۆی بەرپرسیارە، ئیتر با لەمەودوا سەربازەکان بە خێرایی بگەڕێنەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان ، جا خوێنەری خۆشەویست بە وردی سەرنجی ئەم باسە بدە، کەواتە کۆمەڵگای موسڵمان کۆمەڵگایەکی داخراو نیە یەعنی هەموی دەست بە ئەژنۆ و دەست لە دونیا بەردار نەبوون ، هەم پیاوی دنیا بوون هەم

پیاوی قیامەت بوون لە هیچیان دابڕاو نەبوون چونکە بەڕاستی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوون "صلی الله علیه وسلم" هەروەها ئەو دەرسەشمان پێ دەڵێت: کە چارەسەری کێشەی جنسی لاوان لە ئیسلام دایە، ئیسلام نەهاتووە بە قامچی لەپشتی خەڵك بدا و بڵێ تۆ بێ حەیا و بێ حورمەتی دەبێ کچ هەتا ماوە شوو نەکات و پرچی سپی بهۆنێتەوە کوڕ ژن نەهێنێ هەتا ماوە ڕەبەن بێت، نەخێر سەیرکەن خوێنەرانی بەڕێز ئیمامی عمر بەو ئافرەتەی نەوت تۆ بێ ڕەوشت و بێ ئابڕوی، نەخێر ئەو ئافرەتە و هەموو مرۆڤێکیش کە خوا دروستی کردووە مافی خۆیەتی چۆن داوای خواردن و خۆراك دەکات ئاواش داوای مافی جنسی بکات و ڕێز لەغەریزە جنسیەکەی بگرێ، جا خۆشەویستان لێرەدا کۆتایی بەم باسە گەورە و گرانە دێنم، ان شاء الله لە دوای ئەم کتێبە کتێبێکی تر دەنوسین بە ناوی " غەریزەی جنسی لەنێوان دیدی ئیسلام و عەلمانیەت دا " بە ئومێدی ئەوەی گەنج و لاوەکانمان زیاتر شارەزای دینەکەیان بن !

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز

٢- الأخلاق والأسلامية للمسلمين عامة وللخطباء خاصة – بقلم سعد يوسف محمود أبو عزيز – الجزء الثالث .

٣- صحيح البخارى
للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بردزبة الجعفي البخارى المتوفي سنة ٢٥٦ هـ
طبعة محققة على عدة نسخ و عن نسخة فتح البارى التي حقق أصولها و اجازها
الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز

٤- صحيح مسلم
تأليف اللإمام أبي الحسين مسلم بن الحجاج
شرحه اللإمام النووي ترقيم و ترتيب
محمد فؤاد عبدالباقي
إعتني به و حققه على خمس مخطوطات
أبو عبدالرحمن عادل بن سعد
دار ابن الهيثم
القاهيرة – ت و فاكس ٤٢١٠٩٨٦

٥- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا – نوسینی – ماموستا علی باپیر

٦- ئافرەت و قەیرانی ناسنامەو مەیدا نخوازی یەکانی داهاتوو .

٧- ئایدز پوختەیەك دەربارەی نیشانەو شێوازەکانی خۆپاراستن .
نوسینی : دکتۆر حسین الله مورادی
وەرگێڕان : مودریك عەلی عارف

چاپی یەکەم : ٢٠١١

٨- ئایدزو نەخۆشی یە گوێزراوەکان لە ڕێگای سێکسەوە .

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی د. فریدون إبراهیم عبدالرحمن

٩- بەرەو بەختیاری ئافرەت .

نوسینی : جمال حبیب الله

چاپی یەکەم ١٤٢ك – ١٩٩٩ز .

١٠- بالاّ پۆشی .

نوسینی : بەیان ئامق

چاپی دووەم ٢٠٠٦

١١- بالاّ پۆشی : ڕێگایەك بۆ بەختەوەری .

نوسینی : عبدالحمید البلالی

وەرگێڕانی : هیوا محمود جاف

چاپی یەکەم : ٢٠١٠ ز - ١٤٣١ ك

١٢- پۆشاکی ئافرەت و کاریگەری لەسەر کۆمەڵ .

نوسینی : محسن عبدالحمید

وەرگێڕانی : هەورامان محمدأمین

چاپی یەکەم : ١٤١٦ك - ١٩٩٥ ز

١٣- پۆشاکی ڕۆژئاوایی لە دادگای عەقڵ و لۆژین دا.

ئامادەکردنی : لهۆن قادر

چاپی یەکەم : ١٤١٨ ك - ١٩٩٨ ز

١٤- پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆش بەختی تاك و کۆمەڵە

نوسینی : أحمد میرزا ڕۆستەمی ژێرو

ساڵی ٢٠٠٩

١٥- تەوژمی جنس و هەرەسی لاوەکان.

نوسینی : مصطفی زمانی
وەرگێڕانی : هێرش محمود سەنگەسەری
چاپی چوارەم : ٢٠١٠ ز
١٦- حەڵاڵ و حەرام لە ئیسلام دا .
نوسینی : د. یوسف قەرزاوی
وەرگێڕانی : مامۆستا ملا حمەأمین کریم
چاپی یەکەم : ٢٠٠٣ م
١٧- دین و ژین لە ژێر ڕۆشنانی و سپاردەکانی ( رب العالمین ).
نوسینی : فاتیح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی
چاپی یەکەم : ١٤٢٦ ك - ٢٠٠٥ ز
١٦- ڕەوشتی ئافرەت لە ئیسلام دا .
نوسینی : محمد رشدی عبید
وەرگێڕانی : غازی إسماعیل
چاپی دووەم : ١٤٣١ك - ٢٠١٠ ز
١٧- ژنان و کارو باری ژنان لە ئیسلام دا
نوسینی : ئەحمەد و کاکە محمود
چاپی یەکەم : ١٤٣٠ ك - ٢٠٠٩ ز
١٨- فیقهی ئافرەتی موسڵمان
نوسینی : إبراهیم أحمد جمل
وەرگێڕانی : أبوبکری صدیقی
چاپی یەکەم : ١٤١٩ ك - ١٩٩٨ ز
١٩- لاوان و ئاستەنگەکانی سەردەم .
نوسینی : عبدالسلام مەدەنی
چاپی یەکەم : ٢٠٠٨ ز

٢٠- هیمەت بەرزی .

نوسینی : ئەندازیار عوسمان

چاپی یەکەم : ٢٠٠٧

٢١- هاکا ئیسلام گەڕایەوە، توێژینەوەیەکی کورت دەربارەی داهاتوی ئیسلام

نوسینی : ئیکرام کەریم

چاپی یەکەم : ٢٠٠٩ ز

## حیجاب تاجە

بەسەری هەموو کەس ناشێ
ئالای دەوڵەتی ڕەوشتە
نەک تەنها پارچە قوماشێ
چەکی بەرگری و شەرەفە
ئەسمێت گشت گورگ و دالاشێ

چاپخانەی سیما